ڕوڤار
ژمارە ٨٥
مایس -حوزەیران
ڕوڤار، بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە
هەر ژمارەی تایبەتە بەداهێنەرێکی کورد
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
دوو مانگ جارێك دەریدەکات

## ژمارەکانی ڕابردووی ڕۆڤار

ئیبراهیم ئەحمەد، محەمەد مەولود (مەم)، کەمال مەزهەر، لەتیف حامید، سوارە ئیلخانی زادە، محێدین زەنگەنە، ئەحمەد هەردی، یەڵماز گۆنای، ئیسماعیل بێشکچی، موحەرەم موحەمەد ئەمین، دڵدار، مەستورەی ئەردەڵانی، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، جەمال عیرفان، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، جەلالی میرزا کەریم، ڕەفیق چالاك، عەبدولخالق مەعروف، هێمن، حسێن حوزنی موکریانی، ئەمین فەیزی، کامەران موکری، جەلال تەقی، حەمە سالح دیلان، هەژار، شاکر فەتاح، کاکەی فەلاح، عەلائەدین سەجادی، شێخ محەمەدی خاڵ، حسێن عارف، عەلی ئەشرەفی دەروێشیان، سەلیم بەرەکات، پێشەوا قازی محەمەد، مەحمود مەلا عیزەت، فایەق بێکەس، عەبدوڵا پەشێو، جگەرخوێن، بابەتاهیری عوریان، عەرەب شەمۆ، دڵشاد مەریوانی، مەنسوری یاقوتی، حەسەنی قزڵجی، برایم ئەمین باڵدار، مەسعود محەمەد، بەختیار زێوەر، نەجمەدینی مەلا، مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی، لەتیف هەڵمەت، حاجی قادری کۆیی، پیرەمێردی نەمر، مەلا مەحمودی بایەزیدی، شێخ ڕەزای تاڵەبانی، شەریف پاشای خەندان، جەمیل صائیب، ئەحمەد موختار جاف، عەبدولڕەحیم ڕەحیمی هەکاری، میر شەرەف خانی بەدلیسی، وەفایی، گۆران، بەدیع باباجان، جەمال شارباژێڕی، مارف بەرزنجی، نالی، مەحموی، ئەنوەر قەرەداخی، حەمەی مەلا کەریم، سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی، ئیبراهیم یونسی، قەرەنی جەمیل، مەلای گەورەی کۆیە، تۆفیق وەهبی بەگ، محەمەد ئەمین زەکی، عەبدوڵڵا جەوهەر، مستەفا بەگی کوردی، شێرکۆ بێکەس، سالم، عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ، ئەحمەد کایا، مەولەوی،قانیع.عوسمان چێوار.کەریم کابان


سەرنووسەر
ڕەووف بێگەرد

بەڕێوەبەری نووسین
ئیدریس عەلی

گرافیك دیزاین
ئارام عەلی

تیراژ: ١٢٠٠

نرخ: ١٢٥٠

ناونیشان
سلێمانی- شارێی سالم
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

www.serdem.net

پەیوەندیکردن بەڕۆڤارەوە لەڕێگەی
ئیمێڵی
edrisali16@yahoo.com

چاپخانەی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

سەرۆکی فەخری
شێرکۆ بێکەس

سەرۆکی دەزگا
ئازاد بەرزنجی

سوپاس بۆ (بنکەی ژین) کە وێنەکانی ئەم ژمارەی ڕۆڤاریان دابینکرد

# ڕەفیق حیلمی...
# تروسکاییەك بەرەو ڕۆشنگەریی

لە خوێندنەوەی ژیان و کارنامەی ڕەفیق حیلمیدا، ڕاستیەک هەیە پێویستە بە هەند وەربگیرێت. کارەکانی ئەم مامۆستا زانا و بەتوانایە تروسکەییەکن بەرەو ئاقاری ڕۆشنگەریی و دەرچوون لە چوارچێوەی ئەو نووسینانەی کە زیاتر پابەندی بەها تەقلیدیەکانن لە بواری ڕەخنە و هەڵسەنگاندنی دەقی ئەدەبیدا. لە کتێبی (شیعر و ئەدەبیاتی کوردی)دا کە لە دوو بەرگا چاپ و بڵاوکراوەتەوە. بە دیدێکی سەردەمانەوە ڕەخنە و توێژینەوە لەسەر کۆمەڵێک بەرهەمی شیعری کوردی دەکات کە پێشتر بەو دیدە تازەیەوە نەکراون. چ لەسەر ئاستی ئاکادیمی و چ لەسەر ئاستی ئەو بۆچوونە تازانەی بۆ یەکەمجار دێنە ناو کلتووری کوردیەوە و تاڕادەیەک سیماییەکی ئەوروپاییان لەخۆ گرتوە. ئەمە نەک تەنیا لە بواری هەڵسەنگاندنی شیعرا بەڵکوو تەنانەت لە شەش بەشەکەی (یاداشت)ەکانیشدا ئەم تروسکەییە دەبینرێت. بێگومان ئەم ڕوانینە ناوازەیە لەخۆوە نەهاتوە. بەڵکوو بەرئەنجامێکی حەتمیە بۆ کەسێکی هۆشیار و ڕووناکبیر کە ماوەیەک لە ئەستەمووڵ خوێندوویەتی و زمانی تورکی چاک زانیوە. لەو سەردەمەدا ئەستەمووڵ پێگەیەکی گرنگی هەبوە لە پێک گەیاندنی کلتووری خۆراوا بە خۆرهەڵات، بەتایبەت کە بزووتنەوەیەکی گرنگی ئەدەبی و هونەریی لە تورکیادا سەری هەڵداوە کە تەواو لەژێر کاریگەریی قوتابخانە و ڕێبازەکانی ئەوروپادا بوە. لەپاڵ ئەمەدا مامۆستا زمانی فەرەنسیشی زانیوە کە بۆ ئەو سەردەمە پاریس مەڵبەندی هەرە دیاری ئەو بزوتنەوە فیکری و فەلسەفی و ئەدەبیانە بوە و گەلێک لە نووسەر و ڕوناکبیر و ئەدیبی گەورەی دنیا لەوێ ژیاون کە تا ئێستاش شایانی باس کردنن. ئەم کاریگەریانە لەسەر مامۆستا ڕەفیق حیلمی تەنیا لە بواری نووسین و ڕەخنە و لێکۆڵینەوەی ئەدەبیدا نەبوە. بەڵکوو بوونەتە سەرچاوەیەک بۆ لایەنی بیری سیاسی و هەڵوێستی تایبەتی خۆی بەرانبەر ڕووداوە ئاڵۆزەکانی ئەو سەردەمە و بەرەنجامەکانی کۆتایی شەڕی دوەمی جیهان کە تا ڕادەیەکی زۆر نەخشە سیاسیەکەی دنیای گۆڕی. جگەلەوەی کە تەنانەت سەدەکەیش ناونرا بە سەدەی میللەتە ژێردەست و بێ قەوارەکان. بەشداریی کردنی ڕەفیق حیلمی لە بزوتنەوەی ئازادیی خوازی کوردا کە لە باشووری کوردستاندا شێخ مەحموودی حەفید سەرۆیەتی دەکرد شایەتێکی بێگەردی ئەم بۆچوونەیە (ئەو ڕاوێژکاری سیاسی شێخ مەحموود و سەرۆکی ڕێکخراوی دارکەر، پاشان سەرۆکی حیزبی "هیوا" بوە کە هەردووکیان لەسەر بنەمای فیکری نەتەوایەتی دامەزراون. بەردەوام لە گۆڤارەکانی ڕۆژی کوردستان و ئومێدی ئیستیقلالدا نووسیویەتی کە زمان حاڵی حکوومەتەکەی شێخ بوون) نابێت ئەوەیش لەیاد بکەین کە ڕەفیق حیلمی وەک ڕووناکبیرێکی بەرپرسیار لە ئایندەی گەلەکەی ڕەخنەی دروستی لە شێخ و فەرمانڕەواییەکەی گرتوە. بەتایبەتیی نەیویستوە شێخ (بە هەر بیانوویەکەوە بێت)

# ژياننامە

تێکۆشەری ناسراوی گەلەکەمان مامۆستا ڕەفیق حیلمی ڕاوێژکاری سیاسیی شێخ مەحمود بووە لە سەردەمی حکومەتی کوردستانی باشووردا. ئەم تێکۆشەرە نەمرەی گەلەکەمان لە ساڵی ١٨٩٨دا لە شاری کەرکووک لەدایک بووە و خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی لە کەرکووک و سلێمانی و ئامادەیی لە بەغدا و پەیمانگای ئەندازەی لە ئەستەمبوڵ تەواو کردووە. لە ساڵی١٩٢٠دا گەڕاوەتەوە کوردستان و بووەتە مامۆستایەکی پسپۆڕی ئەندازە و بیرکاری. لە ماوەی خوێندنی لە ئەستەمبوڵ فێری زمانی تورکی و فەڕەنسی بووە، جگە لە کوردی کە زمانی زگماکی خۆی بووە.
کاتێک شێخ مەحمودی حەفید بۆ جاری دووەم لە مانگی تشرینی یەکەمی ١٩٢٢دا کابینەیەکی تازەی دانا و بوو بە مەلیکی کوردستان، مامۆستا ڕەفیق حیلمیی کردە ڕاوێژکاری ڕامیاریی خۆی. ئەم ناودارە گەلێک وتاری ڕامیاریی لە ڕۆژنامەی "ڕۆژی کوردستان"ی زمانی میریی مەلیک مەحمود نووسی.

کاتێک کە میری کوردستانی باشوور بە پیلانی بەریتانیا و بە زەبری هێزی چەکداری لەناو برا، مامۆستا ڕەفیق حیلمی لەو ناوچەیە دوور خرایەوە و کرا بە مامۆستای بیرکاری، بەڵام دەستی لە کوردایەتی هەڵنەگرت و بۆ گەیشتنی کورد بە مافی چارەنووسی خۆی پتر هەوڵی دا و بووە یەکێک لە ڕێکخەرانی شەڕەکەی بەر دەرکی سەرای سلێمانی لە ساڵی ١٩٣٠ دا و ماوەیەک لەسەر ئەم خەباتەی گیرا.

کاتێک دەستەیەک لە قوتابیان و لاوانی کوردی هەولێر و سلێمانی و کەرکووک و کۆیە و کفری ڕێکخراوێکی ڕامیارییان بە ناوی کۆمەڵەی "دارکەر" دامەزراند و ئامانجیان ڕزگارکردنی کوردستان بوو، بەڵام نەبووە ئەو پارتە جەماوەرییە تاکو لە ساڵی 1939دا مامۆستا ڕەفیق حیلمی کرا بە سەرۆکی ئەو ڕێکخراوە، ناوەکەیشی لەسەر داخوازی ئەو کرا بە "پارتی هیوا".

بە هەوڵ و کۆششی بێوچانی ئەم سەرکردە نەتەوەییە لێهاتووە، زۆر ئەفسەری کوردپەروەر و کاسبکار و ڕووناکبیر بوونە ئەندامی کارای ئەم ڕێکخراوە ڕامیارییەی کوردستان تا ئەو ڕادەیەی بە هەوڵ و هیمەتی ئەو پارتە "مەلا مستەفا بارزانی"ی دەستبەسەر لە سلێمانییەوە دەرباز کرا بۆ ناو خاکی کوردستانی ڕۆژهەڵات و لەوێشەوە لە ١٩٤٣/٧/٢٨ گەیشتەوە ناوچەی بارزان بۆ خۆکۆکردنەوە بۆ بەرپاکردنی شۆڕشی ١٩٤٣-١٩٤٥ی بارزان.

پارتی هیوا تا کۆتایی ساڵی ١٩٤٣ و نیوەی یەکەمی ١٩٤٤ بەهێزترین کۆمەڵەی ڕامیاریی کورد بوو. یارمەتییەکی باشی شۆڕشی ڕزگاریخوازیی بارزانی دا. لە جێی پارتی هیوا دوو ڕێکخراوی ڕامیاریی کورد دروست بوون و پەرەیان سەند، ئەوانیش "پارتی شۆڕش" و "پارتی ڕزگاری" بوون و لە ١٩٤٦/٨/١٦ یش لە شوێنی هەردوو ڕێکخراوە ڕامیارییەکە "پارتی دیموکراتی کوردستان" دروست بوو. مامۆستا "ڕەفیق حیلمی"ش وەک ناودارێکی ڕامیاریی گەورەی کورد مایەوە تاکو لە ١٩٦٠/٨/٤ کۆچی دوایی کرد.

مامۆستا ڕەفیق حیلمی لەگەڵ ئەوەی ناودارێکی ڕامیاریی گەورە بوو، لە هەمان کاتیشدا شاعیرو مێژوونووس و وەرگێڕ و ڕەخنەگری لێهاتووی وێژەی کوردییش بوو، لە ماوەی ژیانیدا ئەم بەرهەمانەی داناوە و بە چاپی گەیاندوون:

١- کورد لە بەرەبەیانی مێژووەوە تا ١٩٢٠، بە زمانی عەرەبی.

٢- خولاسەی مەسەلەی کورد، لە فەڕەنسیەوە کردوویەتی بە کوردی.

٣- شیعر و ئەدەبیاتی کوردی - بەرگی یەکەم لە ١٩٤١ و بەرگی دووەمیشی لە ١٩٥٦ دا بە چاپ گەیاند.

٤- یادداشت "کوردستانی ئێراق و شۆڕشەکانی شێخ مەحمود". شەش بەرگە و هەموویان چاپ کراون.

٥- دیوانێکی شیعری بە ناوی "پاش تەمووز".

جگە لەمانەش، دەیان وتار و لێکۆڵینەوەی بەپێزی لە گۆڤارە کوردییەکانی وەک گەلاوێژ بڵاو کردووەتەوە. مامۆستای نەمر ڕەفیق حیلمی لە ١٩٦٠/٨/٤دا کۆچی دوایی کرد و بەیەکجاری ماڵئاوایی لە نەتەوەکەی کرد. یادیان بەرز و پیرۆز بێت و ڕۆحیان شاد بێت.

# مامۆستا ڕەفیق حیلمی
# ڕۆشنبیر و کوردپەروەر

## د. مکرم تاڵەبانی

ڕەفیق حیلمی، ڕەفیق کوڕی ساڵحی ئامانە (ڕەفیق ساڵح ئامان) لە دانیشتوانی گەڕەکی بولاغی شاری کەرکوکە. وەکو زۆربەی کەسانی ڕۆشنبیری ئەو سەردەمە نازناوی (حیلمی) بۆ خۆی هەڵبژاردووە.
ڕەفیق حیلمی خوێندنی سەرەتایی لە قوتابخانەی (ڕشدیە)ی کەرکوک ئەنجام داوە. لەو سەردەمەدا ئەوەی ئەو قوتابخانەیەی ببردایەتەسەر، یان لە کارێکی حوکومەت دادەمەزرا یان دەچووە شاری موصڵ کە مەرکەزی ولایەت بوو لە خوێندندا سەردەکەوت، بەڵام ئەمە بۆ ئەو ئاسان نەبوو، چوونە ئەستەمولّ ئاسانترو بەسوودتر دەبوو، ڕەفیقیش ئەو ڕێچکەیەی گرتەبەر و چووە ئەستەمولّ بۆ ئەنجام دانی خوێندنی باڵاتر.
لەو سەردەمەی کە ڕەفیق حیلمی لە ئەستەمولّ بوو. لە ئەنجامی ئینقلابێکی سەربازی یەوە لە لایەن بورجوازی تورکی یەوە بە سەرۆکایەتی جەنەڕاڵ مەحمود شوکت "برای دایکی حیکمەت سلێمان پاشاوە جاڕی (مشروطی یەتی) دا بەستنی سوڵتان بە یاسای بنەمایی (قانون اساسی) و لە پاشان بە لابردنی

سوڵتان عبد الحمید و دانانی سوڵتان رشادی برای، ئیتحادوو تەرەقی دەسەڵاتی وەرگرت. هەرچەندە لەسەرەتای دامەزراندنی کۆمەڵەی ئیتحادوتەرەقی زۆربەی میللەتانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی وەکو: عەرەب و کوردو چەرکەس.. هتد. بەشداریان کرد، بەڵام هەر کە بورجوازی تورک دەسەڵاتیان وەرگرت، کەوتنە سەرکوت کردنی میللەتانی تر.
هەر لەو بارەیەوە شێخ ڕەزای تاڵەبانی شاعیر دەڵێت:

زواللی عدالت که یقلمشدی بناسی
بیردەن ئیچنە سچتی بو قانوون اساسی

واتا: دادپەروەری بەسزمان کە بینای ڕووخابوو بەیەکجاری گووی تێکرد، ئەم قانوون اساسی یە، بەرامبەر ئەم باروودۆخە دەبوو کورد لەوە بەولاوە خۆی بۆ داهاتووی خۆی، ئامادە بکات هیچ ڕێگایەکی تری نەبوو، لەبەرئەوە ڕۆشنبیرانی کوردیش کۆمەڵەی (تعالی و ترقی)یان دامەزراندو قوتابیانیش کۆمەڵەی (هێڤی)یان دامەزراند کە ڕەفیق حیلمی یەکێک بوو لە دامەزرێنەرانی ئەو کۆمەڵەیە.
زۆربەی ئەو قوتابیانە، نە بەری خوێندنی باڵا و نە بەری خەباتیان بە دەس نەهێنا، چونکە شەڕی یەکەمی جیهانی بۆ دابەش کردنەوەی مستعمرات، لەنێوان دەوڵەتانی ئیستعمار هەڵگیرساو لە ڕاستیش دا بۆ دابەش کردنی وڵاتانی ئیمپراتۆری عوسمانی بوو. دەوڵەتی عوسمانیش خۆی هاویشتە ناو ئەو شەڕەوە. لەبەرئەوە زۆربەی ئەو کوردانەی ئەستەموڵ کە لەلایەن بەریتانیاوە داگیرکرا، گەڕانەوە وڵاتی خۆیان، هەروا ڕەفیق حیلمیش هاتەوە کوردستانی باشوور کە بە ولایەتی موصل ناودەبرا.
هەرچەندە مافی کورد بەنیوە چڵی لە پەیمانی (سیڤر) دا تۆمار کرابوو، هەر وەکو وەزیری دەرەوەی فەرەنسا وتی: "ئەم پەیمانە هەر وەکو ئەو گوڵدانەی کە لەشاری سیڤر دروست دەکرێت دەشکێنرێت، ئەمەش لەناو دەبرێت و هەروایش بوو. ڕەفیق حیلمی کە گەڕایەوە کوردستانی باشوور کورد بۆ مافی چارەنووسی خۆی خەباتی دەکرد. شێخ محمود دەیزانی ئینگلیز هیچ بۆ کورد ناکات و دەستی بۆ هەرلایەکی تریش درێژ دەکرد، وەکو پووشکە بە دەستیەوە دەهات، لەوە بەولاوە بە پشت بەستن بە میللەتی خۆی و خەبات لە پێناوی سەربەخۆیی کوردستان، هیچ ڕێگایەکی تری نەبوو، ئینگلیز دەیویست شێخ ببێتە (ڕاجا)1یەکی هندی و دەسەڵاتی لە سنووری سلێمانی بەولاوە نەبێت، کە شێخ محمود بەمە قایل نەبوو، بۆیە لەیەک لاوە جاڕی سەربەخۆیی کوردستان و دامەزراندنی حکومەتێکی کوردی هیچ ڕێگای تری نەبوو، هەروایشی کرد. ڕەفیق حیلمی یەکێک بوو لەو ڕۆشنبیرانەی کەپشت گیری ئەم حکومەتەی کردو خۆی تەرخان کرد بۆ بڵاوکردنەوەی خوێندەواری لە سلێمانی و کرایە بەڕێوەبەری قوتابخانەی (محمودیە).
بەریتانیا ئەوەی نەدەویست، لەبەرئەوە بە لەشکرێکی گەورەوە سولەیمانی داگیر کردەوە و شێخ محمودی دەسگیر کرد. ڕەفیق حیلمی سولەیمانی بەجێ هێشت و چووە کەرکووک.
لەو سەردەمە هێشتا ئایندەی ولایەتی موصل کۆتایی نەهاتبوو، تورکیای کەمالیست داوایان دەکرد و تورکانی کەرکوکیش پشتگیری ئەوەیان دەکرد لە کەرکووک تورکمانەکان ڕۆژنامەیێکی تورکی یان بەناوی "ئیلەری بۆ پێشەوە"2 دەردەهێنا، لەوکاتەدا مستەفا کەمال بۆ ڕزگارکردنی تورکیا لە داگیرکەرانی بەریتانیا و یۆنانیەکان، لە شەڕێکی قورسی دا بوو، کوردانی باکوری کوردستانیش، بەهیوای دەستکەوتی مافی نەتەوەیی خۆیان، نەک تەنها پشتگیری، بەڵکو بەجەخت لە ڕیزەکانی تورک دا دژی داگیرکەران دەجەنگان و هەردوولا بە هاوکاری هەرێمەکان ئەو وڵاتەیان ڕزگار دەکرد.
لە کەرکوک ڕەفیق حیلمی لە ڕۆژنامەی (ئیلەری)*

لەسێ ژمارەی دا مەقالێکی بەناوی (شرق ناپلیونی مستەفا کەمال پاشا)ی بڵاوکردەوە – ئەمیش، وەکو کوردانی ئەوێ بەهیوای ئەوە بوو کە کورد لەڕێگای خەباتی هاوبەش دژی داگیرکەران بەمافی خۆی بگات، بەڵام ئەم خەیاڵە خاو بوو.
لەپاش دامەزراندنی حکومەتی عێراق و پێشێل کردنی مافی نەتەوەی کورد، ڕەفیق حیلمیش، هەر وەک ڕۆشنبیرانی کوردی ئەو سەردەمە، لەو حکومەتە کارێکی بۆخۆی قۆستەوە و کرایە مامۆستای (بیرکاری_ ڕیازیات) لە قوتابخانەی ناوەندی، کە لەپاشا بووە قوتابخانەی (الثانویه المرکزیة)* و لەساڵی 1934 – 1937 ڕەفیق حیلمی بەڕێوەبەری ئەو قوتابخانەیە بوو، لەو سەردەمەدا عەزیز سامی کە بە ڕەگەز عەرەب و بوو، بووە تورک، بەڕێوەبەری پەروەردەی کەرکووک بوو، بەهیچ جۆرێک پێکەوە نەگونجان. ئەم کورد پەرست و ئەو تورک پەرست. حکومەت ڕەفیق حیلمی بۆ (العمارة) و عەزیز سامی بۆ بەغدا گواستەوە. کوردانی کەرکووک بە برووسکە بۆ حکوومەت داوای گەڕاندنەوەی ڕەفیق حیلمی یان دەکرد و مامۆستا حیلمی کرایە (پشکنەری پسپۆری ڕیازیات) لە وەزارەتی معارف لە بەغداد.
لەپاش شکستی شۆڕشەکانی شێخ محمود، نەتەوەی کورد هەستی بە بۆشاییێکی سیاسی دەکرد و (کۆمەڵەی برایەتی) کە لەسلێمانی دامەزرا، ئەو بۆشاییەی بۆ پڕ نەدەکرایەوە، لەبەرئەوەی (الثانویة المرکزیة) تەنها خوێندنگای ئامادەیی بوو لە کوردستان، زۆربەی خوێندکاران بۆ ئەنجام دانی ئەم پلەیە دەهاتنە کەرکوک و کەرکووک بووە کۆکەرەوەی خوێنکارانی کوردستان و ژمارەیەکی زۆر لەم ڕۆشنبیرانە لێرەدا کۆبونەوە.
لە ئەیلوولی 1937، لەسەر بانگێشتی یونس ڕەئووف "دڵدار"، پێنج قوتابی لەماڵی بورهانی حامدبەگی جاف لە گەڕەکی (بکر)، کۆبوونەوە، ئەمانە: یونس ڕەئووف، کاکە حەمەی خانەقا، بورهان جاف، مکرم تاڵەبانی و جلال قادر بوون، لەو کۆبوونەوەدا بڕیاریان دا کۆمەڵەیەک بەناوی (دارکەر)، وەکو کۆمەڵەی ئابورناسی کە هەرێمەکانی ئیتاڵی یەک خست، دامەزرێنێت. ئەم کۆمەڵەیە زۆری پێ نەچوو پەلی هاویشت بۆ زۆربەی شاروشارۆچکەکانی کوردستان کە ئیتر لە وزەی قوتابیان نەما بەڕێوەی بەرن.
لە حوزەیرانی 1938 کۆنگرەی دارکەر بەئامادەبوونی 60 ئەندام لە شارو شارۆجکەکانی کوردستان کە بووە تاقی کردنەوەی بەکالوریا لە کەرکووک یەکیان گرتبوو، بڕیار درا ئەم کۆمەڵەیە بکرێتە حیزبێکی سیاسی بۆ ئازادی کوردستان خەبات بکات و بۆ سەرۆکی ئەم حیزبە مامۆستا ڕەفیق حیلمی دەسنیشان کرا کە لەم دەمەدا لەبەغداد بوو. مامۆستا حیلمی ئەمەی زۆر بەخۆشی و شانازی یەوە وەرگرت و بۆ نوێ کردنەوەی ناوی کۆمەڵەی هێڤی کە خۆی یەکێک بوو لە دامەزرێنەری لە ئەستەمبوڵ، ناوی حیزبی (هیوا)ی لێ نرا.
حیزبی هیوا بە سەرۆکایەتی مامۆستا ڕەفیق حیلمی لە ساڵی 1943 یارمەتی مەلا مستەفای بارزانی دا، کە لەدەست بەسەری لە سلێمانی ڕزگار بکات، کە ڕاپەڕینی بارزانیەکان ڕووی دا. هەروا توانی لقێکی بەناوی (کۆمەڵەی ژ. ک) لە مەهەباد دامەزرێنێت.
ئینگلیزەکان لەو سەردەمەدا کە عێراقیان داگیر کردەوە، لە کوردستان دا دوو مەبەستیان هەبوو: – یەکەم: بارودۆخی ئاسایی لە ناوچە شاخاویەکانی کوردستان و بەتایبەت لە ناوچەی

ڕەفیق حیلمی

بارزان سەقامگیر بکرێت، بۆ ئەم مەبەستە زوو بەزوو گوشاری خستە سەر حکومەتی عێراق کە کێشەی بارزانیەکان بەجۆرێکی ئاشتیانە چارەسەر بکات، لەبەرئەوە حکومەت داوای لە مەلا مستەفا کرد بچێت بۆ بەغداد و بڕیاری دا شێخ ئەحمەد و خزمانی و بارزانیەکان بگەڕێنەوە بارزان. مەبەستی دووەم: گەڕانەوەی لەشکری عێراق بۆ ئەو ناوچەیەو مەشق پێکردنی بۆ شەڕی شاخاوی لە ترسی هاتنی لەشکری ئەڵمانیا بۆ ئەو ناوچانە. بەڵام هیچ مەبەستی چارەسەر کردنی کێشەی سیاسی نەتەوەی کورد نەبوو، تەنها بەیانێکی بڵاوکردەوە کە داوای لە کورد دەکرد هێمنی بخەنە ئەو ناوچانە و حکومەتی بەریتانیا، لەپاش کۆتایی شەڕی جیهانی، بەچاوێکی "عطف"

سەیری کێشەی کورد دەکات. کورد ئەو "عطف"ەی بەریتانیای تاقی کردبووەوە، کە ماوەی نیو سەدە لە کوشتن و ماڵوێرانی بەولاوە هیچی تری لەو عطفە دەس نەکەوت، بەپێچەوانەی ئەوەوە کورد ناوچەکانی مەهاباد کە بە یارمەتی هیوا کۆمەڵەی (ژ. ک) و لە پاشان حیزبی دیموکراتی کوردستانی دامەزراند، کەوتە چالاکی ڕێکخستنی جەماوەری میللەت و بوونی لەشکری سۆڤیێتیش یارمەتی دا، کەچی لەشکری بەریتانیا لە دروست کردنەوەی مەخفەری پۆلیس و ئۆردوگا بەولاوە هیچی، نەبۆ بارزانیەکان و نە بۆ نەتەوەی کورد نەدەکرد، لەبەرئەوە ڕێگای بە دروستکردنەوەی بارەگای پۆلیس و گەڕانەوەی لەشکری عێراقی بۆ ناوچەی بارزان نەدا کە ئەمە نیگەرانی بۆ ئینگلیزەکان و هیواش ململانی یەکی قووڵی تێکەوت. سەرۆکی هیوا مامۆستا ڕەفیق حیلمی، هێشتا لەو بڕوایەدا بوو، کە حکومەتی بەریتانیا مافی چارەنووسی کورد دەداو لە سلێمانی ئەفسەری مخابەراتی بەریتانیا (شۆتەر) ڕۆڵێکی دیاری لەمەدا هەبوو بۆ نموونە لە ساڵی 1942 کێشەیەک کەوتە نێوان ئەفسەرانی هیواو مامۆستا حیلمی و بڕیاریان دا لە هیوا جیاببنەوە. من هاتمە سلێمانی و پێوەندیم بە مامۆستا ڕەفیق حیلمی یەوە کرد. وتی ئیمشەو ناتوانم کۆبوونەوە بکەم، چونکە (شوتر)م بانگێش کردووە ئەفسەران دوو ڕەخنەیان هەبوو، یەکەمیان: مامۆستا حیلمی داوای کرد بوو هەموو ئەندامێکی هیوا وێنەی خۆی، بە نووسینەوە (بۆ سەرۆکی باڵا) بدات بەمەبەستی ڕێکخستنی ئەلبۆم بۆ حیزبەکە، ئەمە لەهیچ حیزبێکی نهێنی نەبووە و بەتایبەت بۆ ئەفسەران. دووەمیان: هەموو ئەندامانی هیوا کە بەهەزارانن، لە 5% موچەیان دەدایە حیزب. حیزب نەکادری خۆ تەرخانکەری هەبوو و نە ڕۆژنامە و گۆڤاری دەردەهێنا، دەیانویست بزانن ئەم دارایی یەی حیزب چی لێدێت. من لەو بڕوایەدا بووم مامۆستا حیلمی لەبەرئەوە ئەمەی دەرنەدەخست چونکە

یارمەتی بارزانیەکان و شۆڕشی دەدا.
حکومەت لەپاش ڕاپەڕینی 1943 دەیویست جۆرە چاکسازیەک لە کوردستان دا بکات، بەڵام بەبێ ئەوەی مافی نەتەوەیی بدات. هیوا داوای یەکبوونی لیواکانی کەرکووک و سلێمانی و هەولێر و قەزا کوردیەکانی لیوای موصلی دەکرد. حکومەت ویستی بەوە ئابلوقەی ئەمە بدات، کە لەباتی ئەوە یەکێتی معارف لەم ناوچەیە دروست بکات و ڕەفیق حیلمی بۆ ئەمە دەسنیشان کردبوو. ئەمیش ئەوەی بە چاک دەزانی. لە کۆبوونەوەی سەرکردایەتی و کادرانی حیزب لە بەغدا مامۆستا حیلمی نەیتوانی قایلیان بکات چونکە ئەوان داوای ئۆتۆنۆمی یان دەکرد.

حکومەت بۆ ئیحتیواکردنی هیوا، ماجد مستەفا بەگی کردە وەزیری دەوڵەت. وا دیار بوو کە مامۆستا حیلمی خۆی بە هەقداری ئەم جێگایە دەزانی، لەبەرئەوە لەگەڵ ماجددا کەوتە وتوویژ، ئەم وتوویژە بووە هۆی نیگەرانی ئەندامانی هیواو ڕەفیق حیلمی بیست کادری گەورەی حیزبی دەرهێنا بەناوی ئەوەی پیلانێکی شیوعیە! بۆ چارەسەرکردنی کێشەی نێوان هیواو سەرۆکی عەشیرەتی جاف کەریم بەگ کە ئەندامی هیوا بوو هەندێک لەوانەی بانگێش کردو لە (کەلار) کۆبوونەوەیەک کرا، بەڵام سەری نەگرت، چونکە هەندێک لە ئەفسەرانی هیوا، وەلایەکی دوولایی یان هەبوو، بۆ هیوا و بۆ ماجد مستەفا، لەبەرئەوە نەقیب مجید عەلی و ڕائد مەحمود شێخ طە لەگەڕانەوەیان لە کەلار

ڕەفیق حیلمی

ڕێگایان لە ڕەفیق حیلمی گرتبوو بەزەبری دەمانچە دەست لەکارکێشانەوەی لە سەرۆکی هیوایان پێ مۆر کرد بوو، لەپاشان بۆی دەرکەوت مانەوەی لە هیوا و هەروا مانەوەی حیزبی هیوایش مەحاڵە، بە خواستی خۆی دەستی لە سەرۆکایەتی هیوا کێشایەوەو هیواش مەیدانی بۆ حیزبایەتی نوێ، کە حیزبایەتی شۆڕشگێڕی لەگەڵ ڕۆحی عەسردا گونجاوی چۆڵ کرد.

لەپاش شۆڕشی 1958، مامۆستا ڕەفیق حیلمی پشگیری لە شۆڕش کرد، وەکو لە کۆمەڵە شیعرەکانی (لەپاش تەمموز) دەردەکەوێت لەپاش شۆڕشی 14 تەموزی 1958 مامۆستا حیلمی کرایە مولحەقی سەقافی لە باڵیۆزخانەی عێراق لە تورکیا و لەوەدوا خانەنشینکرا و لەپاش ماوەیەک کۆچی دوایی کرد.

مامۆستا ڕەفیق حیلمی لە سەرەتای ژیانیەوە لەسەر هەستی نەتەوەیی چووە ناو سیاسەتەوە و لە ماوەی سەرۆکایەتی لە حیزبی هیوادا چەند جارێک دوو بەرەکی کەوتە نێوانی لەگەڵ لیژنەی ناوەندی حیزب و ئەو لەو بڕوایەدا بوو کە حکومەتی بەریتانیا لەپاش کۆتایی شەڕی دووەمی جیهانی پشتگیری لە مافی چارەنووسی کورد دەکات تا ئەوەی وای کرد کە لەگەڵ ڕۆحی چەرخی ئەو سەردەمە نەگونجێت و لەزۆربەی ئەندام و جەماوەری حیزبی هیوا دووربکەوێتەوەو داوای دەست کێشانەوەی لە حیزب لێ بکرێت، بەڵام وەکو لە هەڵوێستی لەپاش تەمموزی 1958 دەردەکەوێت، ئەو بیرەی گۆڕی.

حیزبی هیواش وەکو هەموو حیزبێکی سیاسی، وەکو ئادەمیزاد وایە، دەردەکەوێت گەورە دەبێت و ئەگەر خۆی نوێ نەکاتەوە و چاکسازی لەخۆی دا نەکات، لە مێژوو دەردەچێت بۆ ئەوەی ڕێگا بۆ حیزبی نوێ بکاتەوە ئەمە یاسایەکی سروشتی و سیاسی یە.

پەراوێز:

*یان -1 ڕاجا: وشەیەکی هیندیە بەمانای ئەمیر – شازادە دێت.

-2 ئەو ڕۆژنامەیە لەدوای داگیرکردنی عێراق لەلایەن ئینگلیزەکانەوە بەهاوکاری یان ئاگاداری ئەوان لەلایەن تورکمانەکانی کەرکوکەوە بە زمانی تورکی دەردەچوو، کە تەنها چەند ژمارەی دەرچوو.

*الثانوية المركزية: ماوەی چەندین ساڵ، خوێندنگەی (ئامادەیی) لە شارەکانی سلێمانی و هەولێر نەبوون، لەدوای تەواوکردنی قۆناغی خوێندنی ناوەندی قوتابیان بەناچاری دەچوونە ئەو (ثانويه) بۆ تەواوکردنی قۆناغی ئامادەیی.

## کورتەوتەیەک:

# مامۆستا ڕەفیق حیلمی، یەکەم پێشەنگ

**مومتاز حەیدەری**

بە پێچەوانەی ڕەوشی هەرە دژواری گەلی کوردستان -یەک کوردستان-، بەتایبەتی لە شەڕی چاڵدێرانەوە کە بۆ یەکەم جار نیشتمانی نەتەوەیی کورد -کوردستان- لە نێوان دوو دەوڵەتی دەرەبەگی خاوەن دوو مەزهەبی ئایینی جیاواز: سوننە-شیعە، دابەش دەکرێ، واتە لە ماوەی ئەو (500) ساڵەدا، ئەوەی فەرهەنگی مێژووی مرۆڤایەتی ناوی ناوە چەوساندنەوە و ئەشکەنجە و ماڵوێرانی و دەربەدەری و قڕکردنی مرۆیی و نەتەوەیی، لەوانەش ڕووخاندنی میرنیشە کوردییەکان، تا دەگاتە جینۆساید و کیمابارانی هەڵەبجە و پرۆسە هەرە دڕندەییەکەی

ئەنفال و سیاسەتی پاکتاوکردنی ڕەگەزی، پەیڕەو کراوە...
لە ماوەی ئەو (500) ساڵەدا نەک بە دەیان، بگرە بە سەدان کەڵەمرۆی کوردان، لە تێکڕای بوارەکانی ژیاندا هەڵکەوتوون، ژیانی هەر یەکێکیان ڕۆمانێکی گەورە دروست دەکەن، هەڵبەت ناوەرۆکی ئەو ڕۆمانەش بەشێکی گەورە و زیندووی مێژووی شکۆداری نەتەوەییمان دروست دەکەن و هاوکات هەندێکیان نەتەوە باڵادەستەکان -داگیرکەرانی کوردستان- بۆ خۆیان داگیر کردووە، نموونەی عارەب وفارس و تورک...

یەکێک لەو کەڵەمرۆیانە، بەهەق نموونەیەکی کەموێنەی تێکڕای ژیانی کوردەوارییە، بگرە بە پێشەنگێکی ژمارە یەک دەژمێرێ، ئەوەیش کۆچکردووی گەورە مامۆستا ڕەفیق حیلمییە، کە زۆر زەحمەتە لە دەرفەتێکی ئێجگار تەنگەبەر و تەسکدا تەنیا بە چەند لاپەڕەیەکی ساکار پێناسە بکرێ..! نەک لێکۆڵینەوەیەکی هەمەلایەنی: کۆمەڵایەتی، خوێندن و خوێندەواری، کولتووری، سیاسی و نەتەوەیی پڕبەپێستی خۆی بکرێ. ڕاستە ئێمەی کورد خاوەن سەدان مرۆی مەزنین بە هەر دوو ڕەگەزییەوە، بەڵام مامۆستا ڕەفیق حیلمی -من پێم وایە- نموونەیەکی زۆر دەگمەنە -بگرە حاڵەتێکی دەگمەنە-. ئەو (دەگمەنە)یەش لە چەند جەمسەرێکەوە دروست بووە و زۆر بە کورتی ئاماژە بەو جەمسەرانە دەکەم.

* بەراییێکی بەپەلە:
مامۆستا ڕەفیق حیلمی کوڕی محەمەد ساڵح ئەفەندی ئامان، کە گەورە باپیرەی:
میر نەجەف قولی خان سەرۆکی عەشیرەتی بەختیارییە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، لە شارە زێدە چەوساوەکەی کوردان، کلیلی زێڕینی دەوڵەتی نەتەوەیی، شاری کەرکووک، ساڵی 1898ی زاینی لەدایک بووە. هەڵبەت دیارە هەر لەم ساڵەشدا یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی -کوردستان- لە شاری قاهیرە هەموو ژیانی، یان بە واتایەکی دیکە، زاراوەی یەکەم پێشەنگ، ئەو گەورە کۆچکردووەی (مامۆستا ڕەفیق

## ڕەفیق حیلمی

حیلمی) پڕاوپڕ تەنیوەتەوە.
سەیرکەن: بە بۆنەی هێنانەوەی تەرمی جەنابی شێخ سەعیدی حەفید، پاش ئەوەی لە شاری موسڵ بە دەستی پیاوکوژەکانی دەوڵەتی عوسمانی شەهید دەکرێ و لەو کاتەی تەرمەکەی جەنابی شێخ بە کەرکووکدا تێدەپەڕی، ڕەفیق حیلمیی مێردمنداڵ، تەمەن (10) ساڵ، هۆنراوەیەکی شێوەئامێزی درێژ بە زمانی تورکی، لە بەردەم سەدان کەس دەخوێنێتەوە.

ئا لێرەدا بە هۆی شەهیدبوونی شێخ سەعیدەوە، لەو تەمەنەدا بیری نەتەوەیی لە مێشکی ڕەفیق حیلمیدا چەکەرە دەکات! هاوکات هەر لێرەوەش نیشانەی کەسێتیی ئەو لە بەردەم ئەو ئاپۆرە زۆرەدا، لەو سەردەمە دواکەوتووەی کۆمەڵی کوردەواریدا دەردەکەوێ!

دیارە ساڵانی خوێندنی لە کەرکووک، سلێمانی، ئەستەمبوڵ، تا بەدەستهێنانی بڕوانامەی ئەندازە -هەندەسە- لە ئەستەمبوڵ و ئەندامێکی کارای کۆمەڵەی هێڤی هەمووی بەسەرێکەوە سەرەتای قوتابخانەیەکی دژوار و شکۆداری کولتووری، سیاسی، نەتەوەیی دروست دەکەن. هەر لەو سەروبەندەدا لە سەردەمی خوێندنی لە ئەستەمبوڵ، هەروەکو ئاماژەم پێی کردووە، نموونەی ئەندامێکی کارای کۆمەڵی هێڤی دەردەکەوێ.

هەر لێرەشدا، هەمدیسان -پێم وایە- یەکەمین ڕۆشنبیری کوردی باشووری کوردستانە، لەو ڕێکخراوە نەتەوەییەدا ئەندامێکی چالاک و دیار دەبێ... شایانی ئاماژەیە، لەبەر گەورەیی دەوری کۆمەڵەی هێڤی، پاشان ناوی ڕێکخراوی دارکەر، ناوی (هیوا)ی لێدەنێ..! لەوەش ڕۆشنتر، وەکو نوێنەری ئەو کۆمەڵە نەتەوەییە، دەنێردرێتە سوریا بۆ ئەوەی پەیوەندی بە نیشتمانپەروەرانی ئەوێ -سوریا- بکات، دیارە بە سەرکەوتوویی دەگەڕێتەوە. کەواتە یەکەمین نوێنەری سیاسی-نەتەوەیی، بەتایبەتی گەنج بووە و خاوەن ئەزموونێکی ئەوتۆش نەبووە، بەڵام چونکە هەر لە سەرەتاوە خاوەن توانا و ویست و بڕوایەکی پتەو بووە، بۆیە لە کۆمەڵەی هێڤی زوو دەردەکەوێ. هەر لەو ڕەوتەدا خاوەن یەکەم بڕوانامەی ئەندازەیە لە دەرەوەی وڵات... هەمدیسان سەرەڕای زمانی کوردی، زمانی تورکی، عارەبی، فارسی و فەڕەنسیی زۆر باش زانیوە. بۆ یەکەم جار دەبینین، یەکەم ڕۆشنبیری کوردە کتێبەکەی لۆسی، پۆڵ مارگریت دانەری فەڕەنسی و کامەران ئال بەدرخان- ک. ئا. ب-ی ڕاستوخۆ لە زمانی فەڕەنسییەوە بۆ عارەبی وەرگێڕاوە. کتێبەکەش خۆی لە خۆیدا، هەروەکو جەنابی محەمەد ئەمین زەکی بەگ، لە پێشەکییەکەیدا دەڵێ: بە سەرچاوەیەکی گرنگ و دەگمەن، بەتایبەتی بۆ ئەو سەردەمە، دەژمێرێ.. دەستخۆشی لە جەنابی ڕەفیق حیلمی دەکات... هەڵبەت وەرگێڕانی ئەو کتێبە (لێکۆڵینەوە لە شیعری کوردی) نیشانەیەکی پێشکەوتنی ئەدەب و ڕۆشنبیریی کوردە، لەوەش زیاتر، هەستی بەرز و ناسکی ڕەفیق حیلمی دووپات دەکاتەوە.

لە لایەکی دیکەوە دەبینین یەکەم ڕووناکبیرە بەرپەرچی نووسینێکی ناڕەوا دەرهەق بە کوردان دەداتەوە، کە لە لایەن شوکری سەکبان ساڵی 1933 بە زمانی فەڕەنسی نووسراوە. ڕەفیق حیلمی سەرەتا بە زمانی تورکی بڵاوی دەکاتەوە، پاشان هەمان نووسین بە زمانی عارەبییش بڵاو دەکاتەوە! دیارە ئەو وەرگێڕانەش ژمارەی یەکەم وەردەگرێ، کە نووسینێکی خۆی بۆ ئەوەی زیاتر دەوری خۆی بگەیەنێ، بە دوو زمان

بڵاو دەکاتەوە. هەر لەو سەروبەندی زمانزانی و گرنگیی مەسەلەی وەرگێڕان، لە سەرەتای هاتنی ئینگلیز بۆ کوردستان، هاوکات سەرهەڵدانی جوڵانەوە نەتەوەییەکەی شێخ مەحمودی حەفید لە ناوچەی سلێمانی، حاکمە سیاسییەکانی ئینگلیز داوا و تکایەکی زۆریان لە مامۆستا ڕەفیق حیلمی کردووە، کە بە وەرگێڕیی ئەوان ڕەزامەند بێت، هەڵبەت ئەوەش -کاری وەرگێڕی- نیشانەیەکی دیکەی هەڵکەوتنی مامۆستا ڕەفیق حیلمی دووپات دەکاتەوە. تەنانەت ئینگلیزەکان داوایان لێکردووە وەکو مامۆستایەکی زمان فێری زمانی فارسییان بکات، بەتایبەتی حاکمی سیاسیی ئینگلیز کابتن بێل! واتە لە یەک کاتدا هەم دەوری مامۆستا دەبینێ، هەم وەرگێڕێکی کارامە. لێرەشدا هەمدیسان بەڵگەیەکی دەگمەنیی توانا و زیرەکیی هەمەلایەنیی مامۆستا ڕەفیق حیلمی دەردەکەوێت!

* لە چوارچێوە گشتییەکەی ژیانی کولتووری و سیاسیدا، ڕۆڵی مامۆستا ڕەفیق حیلمی لە سەردەمی دەرکەوتنی شێخی مەزن و جوڵانەوە نەتەوەییەکەیدا زۆر گرنگ و بەهادارە و لەو بارەیەوە پێویست بە نووسینی کتێبێک دەکات. بۆیە تەنها وەک بیرخستنەوەیەک ئاماژەم پێی کرد. هەر لە سەروبەندی ژیانی سیاسیدا مامۆستا ڕەفیق حیلمی بە یەکەم سەرۆکی حزبێکی نەتەوەپەروەری سەرتاسەری کوردستان (حزبی هیوا) دادەنرێ؛ یان لە کاتی هەڵبژاردنی ناوەڕاستی پەنجاکان (1954) خۆی بۆ ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق کاندید دەکات. هەروەها پاش (14ی تەمموز) هەمدیسان لە مەیدانی سیاسیدا وەکو دیموکراتخوازێکی سەربەخۆی چەپ، دەوری خۆی بە گەورەیی گێڕاوە، تەنانەت بۆ وەرگرتنی مۆڵەتی حزبی جەمهوری -کۆماری-، مامۆستا ڕەفیق حیلمی ئەندامێکی سەرەکیی ئەو حزبە بووە. نیشانەیەکی دیکەی پێشەنگیی ژمارە یەکەم، نووسینی یادداشتەکەیەتی. دیارە نووسینی یادداشت، کە دیاردەیەکی شارستانی، کولتووری

و سیاسییە بۆ نووسینەوەی مێژووی هەر نەتەوەیەک، کەرەستەیەکی زۆر گرنگە. لەوەش ڕۆشنتر، سەبارەت بە کورد تا ئێستا، ئەوە سەدەی بیستویەکە، گرنگیی تەواو بە نووسینەوەی یادداشت -بیرەوەری- نەدراوە!؟ جا لێرەدا مامۆستا ڕەفیق یەکەم ڕووناکبیرە لە مەیدانی نووسینەوەی یادداشتی: سیا سی – نە تە و ە ییدا . کەواتە لێرەشدا گرەوی پێشەنگایەتی وەدەست دێنێ!! دیاریشە، هەر شەش بەرگەکەی یادداشتەکە چەند بەنرخە و کەلێنێکی گەورە لە مەیدانی نووسینەوەی مێژووی نوێی بزوتنەوەی ڕ ز گا ر یخوا ز ی گە لی کوردستان پڕ دەکاتەوە.

هە مد یسا ن شاکارێکی دیکەی ئەو ڕووناکبیرە، بگرە ئەو گەورە پیاوەی کوردان، مامۆستا حیلمی، بریتییە لە کتێبی (شیعرو ئەدەبیاتی کوردی)، کە بەیەکەمین کتێبی لێکۆڵینەوەی ئەدەبی- ڕەخنەیی پێشڕەو دەژمێرێ، کە شیعری (24) شاعیری ناسراوی کوردستان لەخۆ دەگرێ! ئەم کتێبە بەردی لێکۆڵینەوەی مێژوویی: ئەدەبی-ڕەخنەیی دانا، بۆیە بە کتێبی پێشەنگ (ریادی) دەژمێرێ، کەواتە نووسەرەکەی بە لێکۆڵەرەوەیەکی پێشەنگی مەیدانی ئەدەبیاتی هاوچەرخ و نوێی کورد دەژمێرێ.

هەر لەبارەی چالاکیی هەمەڕەنگ و نووسینی سیاسی و ئەدەبی و مێژوویی و وەرگێڕان، زۆر ئاستەمە تەنانەت وەکو پێناسەییێکیش باس بکرێ. بۆیە لێرەدا تەنیا ناونیشانەکانی دەخەینە بەرچاوان: کتێبی (الجغرافیە الاولیە) وەرگێڕان، (نامیلکەی کۆمەڵایەتی) وەرگێڕان، (خولاسەی مەسئەلەی کورد) وەرگێڕان، (مەقالات) نووسین

ڕەفیق حیلمی

و وەرگێڕان، ئەمانە و بە دەیان نووسین و بابەت لە گۆڤاری گەلاوێژ، ژین، ژیان، پێشکەوتن و هیی دیکە، هاوکات بەشدارییەکی کارای لە ڕۆژنامەکانی سەردەمی شێخ مەحمودی حەفید، بەتایبەتی ڕۆژنامەی ئومێدی ئیستیقلال کردووە. لەتەک ئەمانەدا، چالاکیی هەمەچەشنی پەروەردەیی، ڕۆشنبیری، سەندیکایی و کۆمەڵایەتیی هەبووە و نموونەی مامۆستایەکی بەتوانای سەرکەوتوو بووە، ئەندامی یانەی سەرکەوتنی کوردان، ئەندامی کۆمەڵەی بڵاوکردنەوە و وەرگێڕان و دانان، جێگری نەقیبی سەندیکای مامۆستایانی عێراق، جێگری سەرۆکی یەکێتیی نووسەرانی عێراق بووە. ئەمانە و ساڵی (1959ش) پاشکۆی ڕۆشنبیری لە باڵوێزخانەی عێراق لە شاری ئەستەمبول بووە. هاوکات دیوانێکی شیعری (پاش تەمووز. هتد...)ی بڵاو کردووەتەوە.

ئەوەی ڕاستی بێت، مامۆستا ڕەفیق حیلمی هەروەکو لە سەرەتاوە گوتوومە: نموونەیەکی دەگمەن بووە، بگرە دیاردەیەکی دەگمەن بووە، بە ئاسانی پێناسە ناکرێ، بەتایبەتی لەبەر ڕۆشنایی زانستی مێژوو، کە چ دەورێکی گەورەی ڕووناکبیری و سیاسی و نەتەوەیی لە مێژووی نوێی نەتەوەیی کورد، بەتایبەتی لە باشووری کوردستان گێڕاوە و من لەو کورتەنووسینەدا تەنیا وەکو چەند سەرەباسێکی بەپەلە ئاماژەم پێیان کردووە، واتە: ئەم نووسینەی من ناچێتە خانەی لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندنێکی سەرتاسەریی تەواو لەبارەی دەوری مامۆستا ڕەفیق حیلمییەوە.

بۆیەکە داوای لێبووردن لە گیانی پاکی مامۆستای گەورە و پێشڕەو دەکەم، هاوکات سوپاس بۆ بڵاوکراوەی نموونەیی ڕۆڤار، کە ئەو دەرفەتەی پێدام بەم کورتەنووسینە، بەشداریی ئەم ژمارەیەی (ڕۆڤاری پێشڕەو) بم، هەروەها سوپاسی برای بەڕێز مامۆستا ئیدریس عەلی دەکەم، کە بە پەرۆشەوە داوای لێکردم شتێ بنووسم. هاوکات، ڕێز و پێزانین بۆ تێکڕای سەرنووسەر و ستافی کارامەیی دەزگای سەردەم و ڕۆڤاری تاقانە دەکەم... بە ڕاستی کاری کولتووریی گەورە دەکەن.. نموونەی هەر هەمووتان زۆر بن.

* یادی ئەو مرۆ مەزنە لە بیرەوەریی مێژوویی کورددا هەردەم زیندوو بێت. سوپاس.

هەولێر

20/6/2015

* سەرچاوەی نووسینەکە:

-1 ژمارەیەک لە چاپکراوەکانی م. ڕەفیق حیلمی.

-2 ڕەفیق حیلمي، دراسة تأريخية في نشاطه السياسي والثقافي – شاخوان عبدالله صابر مطبعة شڤان – 2007.

# ئەو ڕۆژەی کە ئینشا بوو بە ئەشیا!

مستەفا ساڵح کەریم

قوتابیی پۆلی شەشەمی سەرەتایی بووم، کە ئەم بەسەرهاتەی لێرەدا دەیگێڕمەوە، ڕووی دا. ئەوسا مامۆستا "معلم" لە قوتابخانەکاندا کەم بوون. وا ڕێکەوت مامۆستایەکمان لەبری دەرسێک دوو دەرسی پێ دەوتین: عەرەبی و ئەشیا و صحە، ئەمەی دواییان لەباتی زانیاری و تەندروستیی ئێستا بوو. لە خشتەی وانەکاندا کە لە پۆلەکەماندا هەڵواسرابوو، دەرسی عەرەبی بەسەر (قەواعید و ئیملا و ئینشا و مەحفوزاتدا) دابەش کرابوو، واتە (ڕێزمان، ڕێنووس، دارشتن، لەبەرکردن). ڕۆژێ لە ڕۆژان هەستمان کرد قوتابخانەکەمان خرۆشاوە. وەک ڕۆژانی تر ئاسایی نەبوو. پاک و خاوێنیی قوتابخانەکە زیاتر بایەخی پێدرا. مامۆستاکان دەروژووریان دەکرد. کارگوزار دەهات و دەچوو. پێش ئەوەی زەنگی چونەژوورەوە لێبدرێ، هەواڵی ڕاستی زانرا، دەنگ بڵاو بووەوە کە سەرپەرشتیاری پەروەردە (موفەتیش) هاتووە. کە چوینە ژووری دەرسخوێندنەوە بەپێی خشتەی پۆل دەرسی (ئینشا)مان هەبوو. بەڵام سەیر ئەوە

بوو کە مامۆستای وانەکەمان هاتە ژوورەوە، بە پەلە لەسەر تەختە ڕەشەکە نووسیی (ئەشیا). ئێمە لای خۆمانەوە سەرسام بووین. یەکێکمان خۆی بۆ نەگیرا وتی: ئەفەنی ئینشامان هەیە. ئەو ڕۆژگارە بە "معلم"مان دەوت: (ئەفەنی). بەڵام مامۆستاکەمان گوێی نەدایە، ئەگەرچی بە تەواوی هەستی بەوە دەکرد کە چەندین نیشانەی پرسیار لە ناوچەوانمانا نەخش بووە و هاوار ئەکەن: بۆچی (ئینشا) بوو بە (ئەشیا)؟ بابەتەکانی دەرسی ئەشیا لە بەرنامەی خوێندنماندا بریتی بوون لە: دەنگ، ڕووناکی، گەرمی، کارەبا، موگناتیس. باش بیرم نییە ئەو ڕۆژە کام بابەتیان بوو، گرنگ ئەوەیە مامۆستاکەمان سەرکەوتوانە هاتە دەست، ئێمەش بەباشی گوێمان لێدەگرت. ئەوەندەی پێنەچوو پیاوێکی بە شانوشەوکەت هاتە ژوورەوە، تا بڵێی بەسام. سەروسیمایەکی جوان، ڕێکپۆش، بە شەخسیەت. بە ئەدەبەوە لەبەری هەستاین و پاشان دانیشتینەوە. میوانەکەمان دوای ئەوەی گوێی لە لایەنێکی دەرسوتنەوەی مامۆستاکەمان گرت. ئەمجا دەرسەکەی لێ وەرگرت و کەوتە پرسیارکردن لێمان. بۆ تەواوکردنی وەڵامەکانمان زۆر لایەنی جۆراوجۆری بە شێوەیەکی جوان و بە کوردییەکی ڕەوان بۆ یەکالا کردینەوە. ئەوی ڕاستی بێ، ئێمەش بە چاکی وەڵاممان ئەدایەوە. چونکە لەوەوبەر ئەو دەرسەمان خوێندبوو، پێش زەنگلێدان بە چەند دەقیقەیێک سوپاسی ما مۆ ستا کە ما نی کرد و بە ڕوویەکی گەشەوە چووە دەرەوە.

ئەفەنی ئەم جارەیان بە زەردەخەنەیەکی شادمانییەوە ڕووی تێکردین و وتی:

"ئەم میوانە گە و ر ە یە ما ن مامۆستا ڕەفیق حیلمی بوو، پیاوێکی ناسراوی بە ناوبانگە لە کوردستاندا، بەوە ناوی دەرکردوە کە میللەتی خۆی زۆر خۆش دەوێ، حەز بە بڵاوبوونەوەی خوێندەواری دەکا، لە ناو لاوانی ئەمڕۆدا زۆر خۆشەویستە".

مامۆستاکەمان لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو و وتی:

"بەڵام چونکە حەقپەروەرە، لە کاری ناحەق زوو پەست دەبێ. چاو لەو کەسە ناپۆشێ کە لە فێرکردندا کەمتەرخەمی دەکا. تووڕەیە و کەس ناتوانێ سەرپێچی لە فەرمانیدا بکات. لێتان ناشارمەوە کە ناوی دەهێنن، زۆربەی مودیری مەکتەبەکان ترسیان لێ ئەنیشێ، منیش بۆیە (ئینشا) م کرد بە (ئەشیا)، چونکە ئەمزانی ئێوە لە ئینشادا ساتمە دەکەن و بە هیچ جۆرێ دەرسەکەمان بە سەلامەتی لێ نەدەڕۆیشت".

**١- ئەحمەد تەقی ٢- ڕەفیق حیلمی ٣- فەتاح بەگی ئەمین عەتار**
ئەندامانی وەفدی شێخ مەحموود بۆ لای کاربەدەستانی کەمالی- ١٩٢٣
سەرچاوە: فەوزی ڕەفیق حیلمی.
٥٨

ڕەفیق حیلمی

***

ئەوە یەکەم جار بوو لە ژیانمدا ئەو پیاوە مەزنە ببینم. لەو سەردەمەدا بە (معلم) نەدەوترا (مامۆستا)، وشەی (ئەفەنی)، واتە (ئەفەندی) بەکار دەهێنرا. بە تەنیا بە ڕەفیق حیلمی دەوترا (مامۆستا). ئەو کاتە نەمدەزانی بۆ؟ بەڵام دوای دە ساڵ زانیم کە بۆچی بە تەنیا بەو دەوترا مامۆستا، بۆچی گەنجانی ئەو سەردەمە سوێندیان بە سەری دەخوارد! زانیم کە ئەو پیاوە بە نهێنی سەرۆکی حزبی "هیوا" بووە. ساڵی 1956 لە (ئەعدادیی مەرکەزی) لە بەغدا بە دیداری شاد بووم . ئیتر لەو ساتەوە ئەو پەیوەندییەمان –منی قوتابی و ئەوی مامۆستا– تا دوارۆژی ژیانی بەردەوام بوو. ئەوەی زیاتر منی لەو نزیک کردەوە، خۆشەویستیی وشەی کوردی بوو، جگە لە ناسیاوێتیی خێزانیی و تازەکردنەوەی ئەو ناسیاوییە لە ڕێی د. مارف خەزنەدارەوە کە ئەو ڕۆژگارە نووسەر بوو لای ئەو لە ئەعدادیەی مەرکەزی و ئێوارانیش لە کۆلێژی ئەدەبیات دەیخوێند.

نایشارمەوە زۆر حەزم بە دەمودوانی دەکرد، گفتوگۆی شیرینی کاری ڕاستەوخۆی لە بەرامبەرەکەی دەکرد. پێم خۆش بوو هەر ئەو قسە بکا و من گوێی لێبگرم. لەتەک ئەو هەموو مەزنییەیدا پیاوێکی تەوازوعکار بوو. بەش بە حاڵی خۆم قەرزاری هاندان و ڕێپیشاندانی ئەوم، بۆیە جارەها وتومە کە ئەو یەکێ بوو لەو پیاوانەی هەرگیز لە بیرم ناچنەوە.

***

مامۆستا ڕەفیق حیلمی تێکۆشەر و سیاسەتمەدار و ئەدیب بوو، یەکێکیش بوو لە پیاوە هەڵکەوتووەکانی بواری پەروەردە. زۆربەی ژیانی بە مامۆستایی و سەرپەرشتیاری پەروەردە و بەڕێوەبەری قوتابخانە و بەڕێوەبەری پەروەردەی شارەکانی وەک عەمارە و باقوبە بردە سەر. ماوەیەکیش کرا بە جێگری ئەمینداری پایتەخت، دوای شۆڕشی تەموزیش کرا بە لێپرسراوی ڕۆشنبیری لە سەفارەتی عێراق لە ئەنقەرە، بەڵام زۆر دڵی پێوەی نەبوو، بۆیە هاتەوە بۆ بەغدا.

* شەش بەرگ یادداشتەکەی بەو شێوازە ئەدەبییە جوانە و دوو بەرگی شیعر و ئەدەبیاتی کوردییەکەی بەو سەلیقە ڕەخنەییەوە. بەرهەمە وەرگێڕراوەکانی لە تورکی و لە فەڕەنسییەوە، ئەمانە گشتیان شوێنی دیاری خۆیان لە کتێبخانەی کوردیدا هەیە.

هاوڕێی خوالێخۆشبووم مامۆستا فەرەیدون علی ئەمین لە باسی مامۆستا ڕەفیق حیلمیدا بۆی گێڕامەوە وتی: کە ئێمە منداڵ بووین، وا باو بوو لە جەژنی ڕەمەزان و قورباندا منداڵانی قوتابخانە کاغەزێکی بچووک، کە هەروەکو پولی پۆستەی ئێستا وێنەی فڕۆکەیەکی لەسەر بوو، ئەیاندا لە سنگ و بەرۆکی خەڵکی. هەر کەسە بە ئارەزووی خۆی پارەی ئەخستە قوتوویەکی داخراوەوە. ئێمەش ئەمانبردەوە بۆ مامۆستاکانمان و بەڕێوەبەری قوتابخانە، هەندێ جار بۆ کەڵکی مانگی سوور بوو، هەندێ جاریش بۆ هێڵی ئاسمانیی عێراق بوو. زۆر باشم بیرە ساڵێکیان من یەکێ بووم لەو قوتابییانەی کە ئەو ئەرکەم پێ سپێررابوو، لای گەراجی ئەسحابەسپییەوە مامۆستا ڕەفیق حیلمیم بینی. بە ڕاکردن و خۆشییەوە لێی نزیک بوومەوە، دەستم برد یەکێ لە وێنەی فڕۆکەکان لە یەخەی چاکەتەکەی بدەم، بەڵام زۆر سەرم سووڕ ما کە دەستی گرتم و دەستی گرت بە یەخەی چاکەتەکەیەوە نەیهێشت ئەو وێنەیە بە یەخەیدا بکەم. کە گەورە بووم، ئەو سەرسووڕمانەم نەما و زانیم بۆچی؟

مامۆست ڕەفیق حیلمی پیاوێکی ڕووناکبیر و خاوەن تاقیکردنەوەیەکی قووڵ بوو. دڵسۆزی خاک و نەتەوەکەی بوو. یەکێک بوو لەو ڕۆشنبیرانەی کە لە شۆڕشی شێخ مەحموددا جێدەستی دیار بوو، هەروەها جێی باوەڕ و متمانەی شێخ بوو، ماوەیەکیش سەرنووسەری ڕۆژنامەی ئومێدی ئیستیقلال بوو، کە زمانحاڵی شۆڕش و حکومەت بوو.
لەبەرئەو مەزنییەی، لەبەر خەبات و ڕەنجی بەردەوامی بۆ گەل کاتێک لە 4/8/1960 دواهەناسەی ژینی دا ، میللەت بە کوڵ بۆی گریا، نەک هەر لە سلێمانی، بەڵکو لە بەغداش پرسەیەکی شکۆداری بۆ دانرا.
وەک لای کورد ئەو ڕێزەی هەبوو، لای ڕووناکبیرانی عەرەبیش شوێنی شیاوی خۆی هەبوو. من بەش بە حاڵی خۆم لە پرسەکەی بەغدادا بەشدار بووم، کە لە باخچەکانی یەکێتیی ئەدیبانی عێراق دوو ئێوارە بۆی دانیشتن، جگە لە بنەماڵەی خۆی، شاعیری گەورە جەواهیری سەرۆکی ئەدیبانی عێراق، عەبدولقادر ئیسماعیل نوێنەری حزبی شیوعی، نەجیب محێدین نەقیبی مامۆستایان، ناجی یوسف خەزووری شەهید سەلام عادل بەو سیفەتەی سەرۆکی دەستەی دامەزرێنەری حزبی جەمهوری بوو، جگە لە چەندین کەسایەتیی تری ناسراو، پێشوازییان لە پرسەکاران دەکرد.
لێرەدا دەبێ ئەوە بڵێم کە مامۆستا حیلمی جێگری سەرۆکی ئەدیبانی عێراق بوو، هەروەها جێگری نەقیبی مامۆستایان بوو. جگە لەوەش، ئەندامێکی دیاری دەستەی دامەزرێنەری حزبی جەمهوری بوو، کە بە پشتیوانیی حزبی شیوعی کەوتبووە کار.
لە کۆتایی ئەم وتارەدا، سەری ڕێز بەرامبەر بەو هەموو خزمەتە لەیادنەچووەی ئەو کەسایەتییە گەورەیە دائەنەوێنم، وشە بەنرخەکانی سەرلەنوێ ئەبنەوە بە چرا بۆ ڕووناککردنەوەی ڕێگای سەختی دوورمان و دەستخۆشیش لە ستافی (ڕۆڤار) دەکەم بۆ ئەم دەستپێشخەرییەی.

**ڕەفیق حیلمی**
**(١٨٩٨-١٩٦٠/٨/٤)**
موحەڕڕیری تورکیی ڕۆژنامەی «بانگی کوردستان»، مودیری مەسئوولو سەرموحەڕڕیری ژمارەکانی ٤-١٣ی ڕۆژنامەی «ئومێدی ئیستیقلال»
سەرچاوە: فەوزی ڕەفیق حیلمی.
٢٥٨

# لاپەڕەیەك لە یادداشتەكانی ڕەفیق حیلمی

**گفتوگۆی دوای نیوە شەو لە تەک (شێخ محمود) و (سمکۆ)**

کات هێشتا زستان بوو، لەگەڵ (خێزان) ێکی سێ کەسی لە خانوە بچکۆلە یەک نهۆمیەکەی صالحی وەستا بستە (صالحی چایچی)، دابووین، لەو دەورەدا خەڵق شەوان زوو ئەگەڕانەوە ماڵەوە. شەوێک لەو شەوانە من لە بەر سارد وسەرما وکەمێ (هەلامەت) نەچووبوومە دەرەوە. لە ژورە بچکۆلە (قوڕینە) کەما دانیشتبووم و لەبەر چرادا (کتێب)ێکم ئەخوێندەوە. تازە ژنم هێنا بوو، هێشتا (مناڵ)مان نەبوو. بەلام ئەیانوت بەرێوەیە. وا دیاربوو زۆرم پێ چووبوو. کە ڕوانیم ژنەکەم نوستوە. تاقە خوشکەکەشم کە هەر بەیەکەوە بووین. لە ژوورەکەی ترا نووستبوو کەدەرگاکەی لە ناو ژوورەکەی ئێمەدا بوو.

هەستام بەبێ خشپە چوومە حەوشە، (هەور)ێکی ڕەش دونیای کردبوو بەشەوە زەنگ، نمەی باران بوو، لەبەر کشوماتی دەرزیت بهاویشتایە گوێت لەترپەی ئەبوو. تازە گەڕابوومە ژوورەوەو کتێبەکەم بەدەستەوە گرتبوو کە لە ماڵەکەی تەنیشتمانەوە بەدەنگێکی ئەسپایی بانگیان کردم، دەنگەکەم ناسیەوە، دەنگی ژنەکەی خورشید بەگی قوڵچی گومرگ بوو، خورشید بەگ زۆر نەبوو بەڕەحمەت چووبوو، ژنەکەی و چەند منداڵێکی لە خانوەکەی تەنیشت ئێمەوە دائەنیشتن، دیوارێکی نزمی قوڕ جیای ئەکردینەوە. لە دەنگی ئەو، ژنەکەم لە خەو هەستا پێم وت زووکە بزانە ماڵی خورشید بەگ بەم شەوە چییان لێ قەوماوە؟!، خێرا چووە دەرەوەو زوو گەڕایەوە، بەڵام شڵەژابوو، ڕەنگی بزرکابوو، هەناسەشی سوار بووبوو، بەدەست وبەچاو ویستی تێم بگەیێنێ، تا لێم پرسی و ویستم بیهێنمە زمان، لەدەرگایان دا، ئەو وەختە هاتە زمان و دەستی برد بۆ دەمم، وتی وەڵامیان مەدەرەوە.

بەرگی دووەم بەشی -١-

یادداشت

رفیق حلمی

ژەنرال إحسان نووری پاشا زەعیمی شۆڕشی کورد لە (ئاگری داغ) لە [توركیا]

ماڵی خورشید بەگ پێیان وتوون کە ئێمە لەم گەڕەکە نەماوین وچەن ڕۆژێکە گواستومانەتەوە. وتم: لەبەرچی؟ وتی: ئەی سێ (تفەنگچی!) بەم شەوە تۆیان بۆ چیە؟ بەڕاستی کات لەوانە بوو کە ئینسان بترسێ، بەڵام ماوەی لێکدانەوەم نەبوو، جارێکی تر لە دەرگاکەمان درا، بەدەم لێدانی دەرگاکەوە وسو ئاغا بانگی کرد: ڕفیق ئەفەندی! منم وسوی خزمەتکارت، ئەم دەنگە ئێمەی وریا کردەوە. وتم شێخ محمود داوام ئەکاو چووم دەرگاکەم کردەوە، (وسوو) دوو تفەنگچیشی لەگەڵ بوو، وتی: فەرموو مەلیک داوات ئەکا، گەڕامەوە بۆ (پالتۆ) و (چرای) دەستیەکەم. دەمانچەکەم بەبێ کیف خستە گیرفانمەوە، خوشکم هەستابوو، سەعات بەرەو دوانزەی شەو ئەچوو، خوشکم وژنەکەم شکیان هەبوو کە بەو نیوەشەوە بۆ لای شیخ محمود بچم، بەڵام دڵنیام کردن وگەڕامەوە لای (وسوو)، مەلیک لە تەنیشت خانوە تازەکەی ئیمڕۆی (میرزا توفیق)ەوە لە خانوەکەی (میرزا فتاح)ی بەرامبەر ماڵی (حاجی ئەمینی کاکە حەمە) دائەنیشت. کە گەیشتینە ماڵی مەلیک، گەلێ لە پیاوە چەکدارەکانی تایبەتی شیخ محمود (ئیشک) یان ئەگرت، تفەنگچیەکی زۆری عشایریش جێ جێ وەستابوون ودانیشتبوون و هەندێکیشیان لە عاستی خۆیانەوە خەو ئەی بردنەوە یا نووستبوون. بەم جۆرە لە دەشتەکەی بەردەمی دەرگای دەرەوە تا دەرگای ژووری دانیشتنی مەلیک، بستێ جێ نەمابوەوە، هەمووی بە تفەنگچی گیرابوو، بەناو ئەمانەدا تێپەڕین و لە (ڕاڕەو)ێکەوە چووینە سەرێ بەردەمی ژوورەکەی (مەلیک). (وسوو ئاغا) لە دیوی دەرەوە بانگی کرد وتی: قوربان! ئەوا (ڕەفیق ئەفەندی!) حازرە. فەرمووی با بێتە ژوورەوە. (لەتیف)ی کوڕی لەو ڕۆژەدا لە دەوری حەوت هەشت ساڵیا بوو، بەڵام وریاو قسە زل و بەکار بوو، هات بە پیرمەوە لەگەڵ ئەو چوومە ژوورەوە.
(سمکۆ) لەلای ڕاستی شیخ محمودەوە و (تایەری

ئەمین ئەفەننی) بەوبەرەوە، بەرامبەر بە شێخ محمود دانیشتبوون، سەلاوم کرد وابزانم وەلامیان نەدامەوە. بۆ (دانیشتن)یش (خولق)یان نەکردم، منیش بە پێوە مامەوە. ئەمە (ڕەسم وعادەت)ی شێخ محمود نەبوو. ئەو ڕێزی لە هەموو میوانێک ئەناو لەبەر منالێک هەڵئەسا، بەتایبەتی دڵی منی زیاد لە خەڵقی تر ڕائەگرت وبەچاوێکی تایبەتی تەماشای ئەکردم، تەنانەت لە هەندێ کەم وکورتیشم ئەبوورد. بە وێنە: لەو دەورەدا ئێواران وەکو هەموو لاوێکی ئەم زەمانە منیش بە (خواردنەوە) ڕام ئەبوارد. شێخ محمود ئەمەی ئەزانی. بەلام جارێک ڕووی لێ گرژ نەکردم، هەندێ شەو کە ئەچووم لای ئەهات ودەمی بۆن ئەکردم. جاری واش ئەبوو کە نەم خواردبێتەوە. بەلام ئەو (سوحبەت) و(گالتە)ی خۆی هەر ئەکرد. جار جارەش (رباعیاتی خەیام) وشیعری (حافز)ی بۆ ئەخوێندمەوە. ئەو شەوەش لەبەر نەخۆشی (هەلامەت) هیچم نەخواردبوەوە، ئەمویست وەکو جاران دمم بۆن کا، کەچی نەیکرد. بە ڕووی ترش وگرژیا شتێکی لەدلا هەبوو.. ئەبوو ڕاوەستم تا دەری ئەخا..لەپڕ ڕووی تێ کردم وتی: لە کوێ بووی؟ وتم لە ماڵەوە، لەودیو دەرگاکەشەوە وسوو ئاغا هاتە جواب، وتی: قوربان بەسەری تۆ لە ماڵەوە بوو، فەرمووی من وام بیست کە ئەمشەو کۆبوونەوەیەکتان بە دەستەوەبووە. وتم: یەعنی چی؟ فەرمووی خۆت ئەیزانی! ئیتر نەیهێشت من قسە بکەم، یان وەڵامی بدەمەوە، وتی: تا ئێستا (مستەفا پاشا) یەک هەبوو. ئێستە هەمووتان لێم بوون بە مستەفا پاشا! ئیتر لە (وزەما) نەما وناتوانم لەمە زیاتر چاوتان لێبپۆشم. ئەبێ یان ئێوە بن یان من!، چیتان لەمن داوەو ئەتانەوێ چی بکەن؟.. هەر چەن من ئەمویست بێمە جواب وشتێ بلێم، ئەو وەکو مەبەستی لە قسە برینی من بێ، ماوەی نەئەدام و یەک لە دوای یەک هەڵی ئەڕشت، جارجارە دەنگی بەرز ئەکردەوەو بەدەم هەڕەشەوە ئەیوت: بلی بزانم! ئەتانەوێ چی بکەن وبەتەمای چین؟، من بە (خائن) و بەدوژمنی کورد دائەنێن؟ من کورد نیم؟ سمایل ئاغا (مەبەستی سمکۆ بوو) کورد نیە؟ ئێوە کوردن و بۆ کوردستان هەوڵ ئەدەن! وا نیە؟ ئێوە کوردستان دروست ئەکەن یا ئینگلیز بۆتان دروست ئەکا؟ مستەفا پاشا دۆستی ئینگلیزەکان بۆچی دەنگی نیەو کوردستان بە ئینگلیز دروست ناکا؟. دیسانەوە تەکانی خۆم دا ویستم قسە بکەم. بەلام ماوەی نەدام. وتی: بڕۆن لەبەرچاوم! هەستن بچن بۆ کەرکوک، بۆ بەغدا. لەوێ لە گەڵ (مستەفا پاشا) لە گەڵ هەرکەسێ کە بە دڵتانەو خۆتان ئەتانەوێ پێکەوە داوا لە ئینگلیز بکەن و کوردستانی پێ دابمەزرێنن!...

من لەم قسانە سەرم (سووڕ) مابوو، دەمم بووبوو بە (تەڵەی تەقیو). کاری ڕاست بێ (سمکۆ) کەوتە فریام، ڕووی کردە شێخ محمود وتی: ماوەیێکی نادەی؟ با ئەویش قسەی خۆی بکات وەلامت بداتەوە!. ئەمە بۆمن هەلێکی باش بوو، تینم دایە خۆم ودەستم کرد بە قسە. وتم: قوربان! ئەگەر ڕاستتان ئەوێ لەم بەزمە حالی نەبووم وهیچ تێ نەگەیشتم، ئینکاری ئەوە ناکەم کەمن کوردم وئامانجی بەرودوام سەربەخۆیی کوردە. بەلام خۆشت ئەیزانی کە شوێن کەس نەکەوتوم وناکەوم، نە ئوزدەمیر (پاشا) ئەناسم ونەپیاوی (مستەفا پاشا)م. ڕاستە، کە (جەمعیەتی کوردستان) هاتە ناو، من بووم بە ئەندامێک، بەلام (ولاخ!) نەبووم کە (ڕەشمە)کەم بەدەست خەڵقەوە بێ. من (عەبد)ی ئەو کەسەم کە کورد بێ و بۆ کورد تێ بکۆشێ. پاشای من و تاجی سەری من

رەفیق حیلمی

ئەوەیە کە کورد بێ. (تۆش)م بۆیە خۆش ئەوێ کە کوردی ولەو باوەڕەدام کەبۆ کورد تێ ئەکۆشی. ئەگەر تۆ من بە کورد دائەنێی و لەبەرئەوە لێم بە شکی، جێی شانازییە بۆم کە دەرم کەی و لەم شارە بچمە دەرەوە..هێشتا بە تەواوی لە وشەکانم نەبوبومەوە کە (سمکۆ) هەستایە سەرپێ و ڕووی کردە شێخ مەحمود وتی: عەرزم کردبووی کە لەو ڕۆژەوە چاوم بە ڕەفیق کەوتوە تێی گەیشتم کە کورێکی بێ غەش وجێی باوەڕە. شێخ مەحمودیش هەستاو ناودەمی ماچ کردم.. فەرمووی ڕەفیق وائەزانی بە ڕاستم بوو، بە قەبری (کاک ئەحمەد) سووحبەتم لەگەڵ ئەکردی. ئینجا دەستی گرتم وبردمیە بەینی خۆی و (سمکۆ) وە.. هەرچەن زستانیش بوو، بەڵام ژوورەکە ئێجگار گەرم کرابوو. منیش ماندوو بووم وعارەق بەناوچەوانما ئەهاتە خوارەوە. پیاڵەیەک چایان بۆ هێنام..داوای ئاوم کرد، ئینجا (شیخ لەتیف) بەدەستی خۆی پیاڵەیەک شەکراوی بۆ هێنام وخواردمەوە.

دوای دانیشتن و خواردنەوەی شەکراوو قاوەی تاڵ و دوای هەندێ سوحبەت و گاڵتەی شێخ مەحمود بەپێی عادەتی خۆی و خۆشی و چلۆنی لەگەڵ سمکۆدا، شێخ مەحمود فەرمووی: ڕەفیق! ئەبێ سوێندم بۆ بخۆی گەگفتوگۆی ئەمشەومان نهێنی بێ و نەچێتە دەرەوە، عەرزم کرد: کەهەر ئەم فەرمایشەی ئەو بەسە بۆئەوە کەباسی ئەمشەو نەگاتەوە دەم کەس، بەڵام لێرەدا شێخ مەحمود نەیهێشتە بەرئەوەی قسەکەم تەواو بکەم، فەرمووی تایەرە فەنی تۆ بچۆرە ئەودیو بۆلای میوانەکان، میوانەکانی ئەودیو، بۆ سبەینێ زانیم کەفەوزی بەگ و هاوڕێکانی بوو (ئیتر وەک مامۆستا حیلمی دەیگێڕێتەوە: شێخ فایلێکی پیشان داوە کەبریتی بوە لەنامەو نوسراوی ئەمدیو لەگەڵ ئوزدەمیرا)، بەتایبەتی تورکەکان لەهاتنی سمکۆ نا قایل بوون، جگەلەوەی کەزۆریش ڕقیان لەمستەفا پاشای یامولکی بوو کەناویان نابوو (نەمرورد) دەیانزانی کە ئەو حەز بەدۆستایەتی ئینگلیز دەکات). م.س.ک

---

تێبینی//

1- وسوو لە (یوسف)وە هاتووە. ئەم وسوو ئاغایە بەڕاستی ئینسان بوو لەناو (پیاو ماقووڵ)ەکانی شیخ محمودا جێگەیێکی بەڕێزی گرتبوو، کەس نەبوو لێی بەگلەیی بێ. بەڵی ئەویش نەخۆیندەوار بوو، لە دەستەی نۆکەرانی شێخ مەحمود ئەژمێررا، بەڵام بەهەمووی مانای وشە خاوەن هەست وتێگەیشتوو زمان پاک بوو، لە چاکە بەولاوە بیری لە هیچ نەئەکردەوە.. ڕەحمەتی خوای لێ بێ.

# دەربارەی نامەیەکی مامۆستا ڕەفیق حیلمی

مامۆستا ڕەفیق حیلمی پیاوێکی هەڵکەوتوو بوو، لەبواری پەروەردەدا دەستێکی باڵای هەبوو لە شۆڕشگێڕی و کوردایەتیدا. یەکێ بوو لە کەسایەتییە نزیکەکانی شێخ مەحمودی نەمر. لە سیاسەتدا سەرۆکی حزبی هیوا بوو، لە نووسیندا سوارچاکی سەردەمی خۆی بوو، یەکێ لە سیفەتە هەرە جوانەکانی تری ئەوەبوو کە پیاوێکی تا بڵێی تەوازوعکار بوو، خۆی بە گەورە نەدەزانی، زۆر دڵی خۆش دەبوو کە خونچەیەکی تازە لە باخچەی ئەدەبیاتا دەگەشایەوە. دەشێ بە نیسبەت یەکێکی وەک منەوە کە

هێشتا لە قۆناغی سەرەتایی نووسیندا بووم و لە ڕێی ستوونە ڕۆژنامەنووسییەکەمەوە لە (ژین)دا لای خوێنەران خەریک بوو ناووناسراویی پەیدا بکەم. مامۆستا حیلمی یەکێ بوو لەو کەسانەی کە بە گەرمی هانی دەدام بۆ بەرەو پێش چوون و بەردەوامبوون لەسەر نووسین. کە کتێبێکی تازە دەردەچوو، بە هۆی کاک شەوقی کوڕیەوە کە هاوڕێم بوو، یان بە هۆی کاک مارف خەزنەدارەوە کە ئەویش لە برادەرە دڵسۆزەکانم بوو، بۆم دەنارد، لەو سەردەمەدا چیرۆکی (خانزاد)ی کاک جەمال بابان و کۆمەڵەچیرۆکی (گۆمی شڵەقاو)ی کاک موحەرەم محەمەد ئەمین دەرچووبوو. ئەوانەم بۆ ناردبوو، هاوکات لە بەغداش مامۆستا تۆفیق وەهبی کتێبی (ئاڵتون کوپرو- جسر الذهب) و (بەهرامی گوڕ)ی لە چاپ دابوو.
ڕۆژێکیان نامەیەکی تایبەتیم لە مامۆستا ڕەفیق حیلمییەوە بۆ هات دەربارەی ئەو کتێبانە، ستایشی خانزادی کردبوو، ڕەخنەشی لە بەرهەمەکانی مامۆستا وەهبی گرتبوو. کە نامەکەم پیشانی کاک ئەحمەد زرنگ دا، ئەو کاتە سەرنووسەری ڕۆژنامەی (ژین)بوو، پێشنیازی کرد کە لە گۆشەکەما نامەکە بڵاو بکەمەوە. کە بڕیارمان دا، زرنگ یەک وشەی لێ لابرد، مامۆستا ڕەفیق حیلمی لە نامەکەیدا نوسیبووی (گیانەکەم کاک مستەفا) زرنگ وشەی (گیانەکەم)ی لابرد وتی با نامەکە لە تایبەتمەندییەوە بکەینە گشتی. ئیتر بەو شێوەیە لە گۆشەکەمدا لە ژمارە (1260)ی ڕۆژنامەی (ژین) دا بڵاو کرایەوە.
ئێستا دوای تێپەڕبوونی 58 ساڵ بەسەر ئەو نامەیەدا لەم ژمارەیەی (ڕۆڤار)دا کە بۆ مامۆستا ڕەفیق حیلمی تەرخان کراوە، لەگەڵ هاوڕێم کاک ڕەئوف بێگەرددا وامان بە باش زانی ئەو نامەیە وەک خۆی بڵاو بکرێتەوە.
مستەفا ساڵح کەریم

سلیمانیه
٤٤/٣/١٩

معالی ماجد بك المحترم    فی المناطق الکردیه

عزیزی . لقد طلبتم الی ابداء رأیی حول الاصلاحات المقتضیة لتنظیم ماکنة الادارة والسیاسة تأمیناً لتوجیه الشعب الکردی نحو الهدف المنشود الا وهو تقویة الروابط بینه وبین اخوانه العرب من جهة واطمئنانه الی نیات الحکومة الحسنة ورکونه الی الهدوء والسکینة فی کل الادوار من جهة اخری . ولکننی قد تأخرت مدة من الزمن وتماطلت کثیراً فی تقدیم آرائی لمعالیکم وذلك لا لعدم اعتمادی علی نوایاکم او لاعتقادی بان فی الامر مالم یشبه ظاهره باطنه، حیث قد مرت علی هذا الشعب خلال العشرین سنة الماضیة تجارب قاسیة دربته علی تقدیر الموقف ومرنته علی کیفیة الاتقاء من شرور الحرکات المضللة ، فلا یوجد هناك کردی قد عماه الجهل الی درجة یصعب معها علیه التمییز بین الحق والباطل وبین الواقع الملموس والغش والخداع . الا ان اهمیة الموضوع قد جعلتنی اتردد کثیراً فی التسرع فی ابداء ملاحظة شخصیة قد تکون تافهة وبعیدة عما تصبوا الیها نفسکم خاصةً وان دخماعتی [illegible] والسیاسیة قد لا تساعدنی علی الاحکام فی المرمی . غیر ان الحاح معالیکم [illegible] وایماز البعض من محبی الاصلاح خاصةً الغیورین علی مصلحة العراق منهم اضطرنی الی التفکیر فی الموضوع تفکیراً مبنیاً علی لزوم وضع مصلحة البلاد فوق کل اعتبار وجعلنی انزل الی میدان الخدمة بجرأة وشجاعة تامتین . فان اول شیئ قمت به هو التطلع الی آراء المفکرین من الاکراد بعد ان تأکدت من ان الرجال المسؤولین عن تدویر سیاسة الدولة هم علی استعداد للقیام بالاصلاحات التی ترغبون عرضها علیهم . فوجدت ان الآراء منقسمة الی اقسام تختلف بعضها عن بعض اختلافاً عظیماً الا انه من الممکن حصرها فی قسمین مهمین کما یأتی :

- الرأی القائل بلزوم تنفیذ کل ما تعهدت به الحکومة العراقیة تجاه الکرد عند دخولها عضو فی عصبة الامم وادرجته فی صلب الدستور دون قید او شرط ودون خلق المشاکل او استعمال سیاسة التضلیل والمماطلة فی تطبیقها علی ان یکون الموظفون المنزهون من الاکراد هم المشرفین علی تنفیذها، مع [illegible] القیام باصلاحات جدیة فی معارف المنطقة الکردیة

لەو هەفتەوە بۆ ئەم هەفتە
نامەیەک بە بۆنەی چیرۆکی خانزادەوە
نوسینی -مامۆستا ڕەفیق حیلمی-
کاک مستەفا!
بەڕاستی و بەدڵ سوپاستان ئەکەم بۆ ئەو دیارییە خۆش و نایاب و بەنرخە کەبۆتان ناردبوم، (خانزاد)، لەکانگای دڵمەوە ئەڵێم: بەڕاستی دیارییەکی هەرە نایابە کەلەم دەوری ووریابوونەوەیەدا پێشکەش خوێنەرەکانی کورد ئەکرێ ئەمە یەکێکە لەو شتانەی کەئەبێ نوسەران و ئەوانەی بەدوای "تەقالیدی" کۆمەڵایەتیمانا ئەگەڕێن هەوڵی بۆ بدەن، چونکە ئەو شتانەی ببنە هۆی دەرخستنی ئەو تەقالیدانەمان (خانزاد) ڕیزی پێشەوە داگیر ئەکا. کاک جەمال عبدالقادر بابان کەڕەنگە بەخزمەتی نەگەیشتبم لەناوچەی چیرۆک نوسەکانا هەنگاوێکی ئێجگار بەجێی هاویشتوە و باشی بۆچوە.
لەیەزدانم ئەوێ دەست وپێنوسی نەڕزێ و بەگەلێ

— ٢ —

الكردية وذلك بفصلها فصلاً تاماً عن وزارة المعارف لتتمكن من وضع مناهج خاصة لمدارس الشمال
وتغيير أنظمة الامتحانات واحضار الكتب الكردية الموافقة لحاجة المنطقة الروحية والاجتماعية
والاشراف على عقيدة ابناء الكرد من البعثات ولرفع الضغط عن الشعور القومي المكبوت وامكان
توجيهه حسب سياسة الدولة العليا مع القيام باصلاحات اخرى مماثلة لها في بقية النواحي
الادارية والاقتصادية والزراعية كتشكيل لوائين آخرين من المناطق الكردية المشمولة بقانون
اللغات المحلية وتعديل نظام انتقاء الموظفين الاداريين لهذه المنطقة وافساح المجال امام الكرد
لانتخاب مندوبيهم من الذين يطمئنون اليهم ويثقون بهم كرسل امناء قد يتمكنون من ايصال
شكاويهم ومطاليبهم المشروعة الى آذان الحكومة عن طريق المجلس وغيرها التي اعتقد انها
قد عرضت كلها أو بعضها على مختلف الحكومات العراقية السابقة بتقارير خاصة مفصلة من
رجالات الكرد البارزين كمعالي امين زكي بك وعلي كمال بك وجمال بك بابان وغيرهم
فاني - اجتناباً من التطويل - اشير على معاليكم المفضل بمراجعة تلك التقارير التي لابد وانها
محفوظة في اضبارات الدولة أو موجودة لدى اصحابها وذلك للاطلاع على نقاط ...
مرة اخرى .

- اما الرأي الثاني فهو التجنب عن كل ما يحدث سوء التفاهم بين الكرد والعرب في العراق مع السعي
لاقناع الرجالات المسؤولين تدريجاً بضرورة احداث تغييرات في سياسة الدولة وفي شكل
الحكم في المنطقة الكردية وذلك عن طريق التفاهم الودي المبني على الاخلاص التام تجاه
العرش وتجاه وحدة البلاد . وقد لا يتم هذا في نظر القائلين بالرأي الثاني الا بعد تحصيل
القناعة الكافية لدى المشتغلين بسياسة البلاد حول لزوم القيام بالاصلاحات اللازمة
المنشودة . فعند ذلك قد لا يصعب على الحكومة اصدار بيان أو تصريح رسمي مع دعوة
ممثلي مختلف الطبقات من الشعب الكردي فوراً للاشتراك في مؤتمر ينعقد تحت رئاسة احد
كبار موظفي الدولة (انكليزياً كان أو عراقياً) على ان يمثل فيه جانب العرب رجالات
بارزين من المشتغلين بالسياسة العراقية وبسياسة الدولة وبهذه الصورة قد تكون
مقررات

— ٣ —

مقررات المؤتمر الصادرة حول الاصلاح المتفق عليه مفرغة في الشكل الذي يلائم السياسة
العليا ومطابقة لمرضاة الجانبين الكردي والعربي بدلاً من ان تكون سبباً لاثارة
الشغب والفتن أو داعياً للانحراف عن السياسة المرسومة للدولة كما انه سوف لا
يوسع شقة الخلاف بين الشعبين أو بين الكرد والحكومة بل انما يمنع الاحتكاكات
التي قد تتولد من المطاليب والمقترحات الصادرة حول الاصلاح من الجانب الكردي
وحده دون ان يكون أي استعداد لقبول مثل هذه المطاليب من الجانب الآخر
(الجانب العربي أم الجانب الحكومي) . خاصة وان المطاليب التي تصدر من الافراد قد تكون
خارجة عن نطاق سياسة الدولة ومضرة بمصالحها أو قد تكون اقل من الحاجة الماسة
لتأمين رضاء الشعب الكردي واخلادهم الى السكينة اخلاداً تاماً وذلك فيما اذا
كانت تلك المطاليب صادرة من جانب واحد أو من قبل أشخاص معدودين قد
لا يجوز لهم تمثيل الشعب الكردي العراقي بأجمعه . هذا بصرف النظر عما ستولد
تلك المطاليب (مشروعة كانت أم غير مشروعة) من الضغائن والاحقاد والفتن
بين هذين الشعبين الذين ما فتئت رجالاتهما البارزين يحاولون بث روح
التآخي والتصافي بينهما بكل ما اوتوا من قوة . واخيراً اصارح معاليكم
بانني اشارك شخصياً اصحاب هذا الرأي وارى انه من انسب الآراء وانجحها
التي قد يؤدي الاخذ به الى الاصلاح المنشود والى حصول التفاهم التام بين
الشعبين الذين من الضروري تآخيهما وتعاضدهما على الدوام . وبالنهاية
اتمنى لمعاليكم التوفيق في مهمتكم الشاقة وارجو للامة وللبلاد التقدم والنجاح
المستمرين ...

ملاحظة : انني قد اهملت الآراء المتطرفة لعدم موافقتها لآرائي الشخصية من جهة ولعدم ملائمتها

— ٤ —

طبيعة الظروف الحاضرة .

المخلص
رفيق حلمي

# ڕەفیق حیلمی

چیرۆکی تری وا کۆمەڵایەتی ڕەنگین و بەنرخ نامەخانەکانمان(*) بڕازێنێتەوە. هەرچەند جێی یەک دوو ڕەخنەی بچوکم بەرچاو کەوت و لەوانەیە کەئەم جێی ڕەخنانە لەوتارێکی ترا بخەمە بەرچاوی کاک (جەمال بابان) ی خۆشەویست. دیسانەوە بەلامەوە وایە کەخانزاد بەتێکڕایی چیرۆکێکی هەرە جوان و واقعییە کەلەکانگای ژیانی کوردەوارییەوە هەڵێنجراوە و یەکەم چیرۆکێکە بەکوردی بابان نوسرابێتەوە و برینەکانی کۆن و دەردەکانی کۆمەڵایەتیمان ئەخاتەوە بەرچاو کە هێشتا بیرمان لەتیماریان نەکردۆتەوە.

(گۆمی شلەقاو)ی کاک (محرم) هەرچەن بێ گەردەو جوانە دیسانەوە ئەگەر لێم ببورن لەچاو (خانزاد)ا ئەکەوێتە پلەی دوەمەوە. تەنانەت

لەبەرئەوە کە (خانزاد) وەکو وتم لاپەڕەیەکی بێ کەم و زیادە لە(واقعی) کۆمەڵایەتیمان، لەدڵی منا نرخی زۆر لە ژوور (بەهرامی گۆڕ)ی مامۆستا وەهبی بەگیشەوەیە.
(بەهرامی گۆڕ) جێی ئینکار نیە، بەری کۆڵینەوەیەکی (علیمی)یە کە تایبەتیە بەمامۆستای مەزن. بەڵام من هەر ئەوەندە ئەڵێم:کە کوردی ئیمرۆ بەتەمای جۆرە خزمەتێکن لەو، کەلەنامەکانی (بەغدا)و (ئاڵتون کوپری)و (بەهرامی گۆڕ)دا چنگیان ناکەوێ. واتە لاوی خوێن گەرمی ئیمرۆ لەنوسینەکانمانا بۆ زاد یا خۆراکی گیان ئەگەڕێن، زانیاریی قوتابخانەکان سەرو زیادیانە، لەو کتێبانەدا کەبەزمانی بێگانە نوسراون و ئەنوسرێنەوە زاد وەرئەگرن.
بەڵام ئەو زادە کەبەوان لازمەو ئەو (غذا)ی گیانە کە لاوی کورد بۆی ئەگەڕێ، لەدەرخستنی تقالیدی کۆمەڵایەتی و نەتەوایەتیا چنگی ئەکەوێ. وە لەبەرئەوەی کە (خانزاد)بەشێکی هەرە بەنرخە لەزەخیرەی تەقالیدی کۆمەڵایەتی کورد بەلامەوە بەنرخترە لە (بەغدا)و (ئاڵتون کوپری) و (بەهرامی گۆڕ). مامۆستای مەزن وەهبی بەگ نابێ لێم زیز بێ کەئەوە ئەڵێم، چونکە من لەگەڵ ئەوەشا مەفتونی زانیاریی بەرزو کۆڵینەوەی زانیارانەی ئەوم و هەرچەندە لەوە ئاگادارم کەشەوو ڕۆژ خەریکەو بەگەرم ئەیەوێ خزمەتی نەتەوەکەی بکا بەڵام داخەکەم تا ئێستا پەی بەوە نەبردوە چۆن خۆی لەخەڵک بەرێتە پێشەوە.
بەڵگەی ئەم وتەیەشم ئەوەیە کەلەم ڕۆژانەدا دۆستێک بۆم ئەنوسێ و ئەڵێ: (بەهرامی گۆڕ)ی مامۆستا وەهبی بەگ بەندیوارێکی بەکوردەوە نیە، ئاڵتون کوپری کە(قۆریاتی) تیابوو دڵی تورکەکانی پێ خۆش کرد. "بەهرام"هی فورسەکانە.ئینجا کەئەمە چەشنی لێکدانەوەی لاوەکانمان بێ ئەرکی خۆپاراستن لەڕەخنەی لاوانی وتوو وریای ئیمرۆ ئەکەوێتە سەرشانی مامۆستای مەزن خۆی. زانیاریی بەرزو فراوانی خۆی بخاتە کارەوە بۆ بڵاوکردنەوەی ئەو نامە خاوێن و تازەیە کە بۆ کوردی داناوە، خۆی لەپێش لاوەکانا هەر بەو زمانە بنوسێ و لەو شتانە بدوێ کە بۆ کورد بەکەڵک بێ و تەقالیدی کۆمەڵایەتی کوردیی پێ بخاتە ڕوو.
گومانی تیا نیە کەمامۆستا وەهبی بەگ یەکێکە لەزانا بەرزەکانی کورد. جا لەبەرئەوە گەل داوای خزمەتی کوردی لێ ئەکا. لێی نابورێ ئەگەر ئەو خەریکی ئەوەبێ خۆی بەزانایانی گێتی بناسێت، یا ناوی لەدونیای شارستانیەتا بڵاوبێتەوە.
سڵاو بۆ هەموان
برات ـ ڕفیق حیلمی ـ
* ((من نامەخانەم بەدڵ نیە وابزانم جێی ـ کتێبخانە ـ ناگرێتەوە))ر.ح.

مستەفا ساڵەح کەریم

بەرگی دووەمی

شعر و ادبیاتی

کوردی

نووسەری

رفیق حلمی

باس ئەم بویژانەی کورد
وشیعرەکانیان ئەخوێننەوە.

دلدار
رەمزی
زیوەر
سالم
سەلام
علی باپیر ئاغا
گوران
نوری شیخ صالح

چاپخانەی (الشباب)
بەغدا : ١٩٥٦م

ثمن النسخة
فلس

شعر و ادبیاتی

کوردی

نووسەر

رفیق حلمی

لەچاپخانەی (تفیض)
لە بغدا
لەچاپ دراوە
١٩٤١

# مەنهەجی مامۆستا ڕەفیق حیلمی لە کتێبی (شیعر و ئەدەبیاتی کوردی)دا

**د. ڕەووف عوسمان**

ئەم کتێبە هەوڵێکی لەمێژینەی پڕبایەخ و دەوڵەمەندی بواری ئەدەبی کوردییە و پێگەیەکی شایستەی باڵای هەیە لە دنیای مێژوو و ڕەخنەی ئەدەبی کوردیدا. لەگەڵ تێپەڕینی دەیان ساڵ بەسەر چێکردنی ئەم بەرهەمەدا، تا هەنووکە تۆسقاڵێک لە پایەی ئەم کتێبە دانەچووە و بیروبۆچوونەکانی مامۆستا ڕەفیق حیلمیش جێگای تایبەتیی خۆیان لە دنیای ڕەخنەی کوردیدا هەیە.

-1 بەر لەم بەرهەمە ناوازەیەی ڕەفیق حیلمی، چەند هەوڵێکی سەرەتایی بەرتەسک هەن لە مەیدانی بیری ڕاگوزاری ڕەخنەییدا، بەڵام هەوڵەکان سەرپێین و لە چەند بەیتەشیعر و پەیڤێکدا وێنا دەبن. ئەحمەدی خانی و حاجی قادری کۆیی و نالی... بەرهەم و شیعرەکانی خۆیان بە چەند بەیتێک هەڵسەنگاندووە و بە

باڵایان بڕیوە، تەنانەت نالی خۆی کردووەتە خاوەنی دیوانی شیعر و سەرقافڵە، ئەمە جگە لە مەجلیسە ئەدەبییەکان کە شیعریان تیا خوێندراوەتەوە و دواجاریش لە لایەن ئامادەبوانەوە هەڵسەنگێنراون؛ هەر بۆ نموونە، پیرەمێردی شاعیر لە یەکێک لە مەجلیسەکاندا بە (ڕەمزی مەلا مارف)ی وتووە (ملک الشعراء).

٢- هەر بە دوای ئەمانەدا ئەمین فەیزی و عەلی باپیر ئاغا (کەمالی) لە دوو بەرهەمی خنجیلانەدا هەندێک ڕاوبۆچوونی ڕەخنەئامێز (إنطباعات) یان تۆمار کردووە لە سێبەری بڵاوکردنەوەی کۆمەڵێک هۆنراوەی شاعیراندا. دەتوانم بڵێم باشترین درێژەپێدەری ئەم ڕێبازە مامۆستا ڕەفیق حیلمییە لە کتێبی (شیعر و ئەدەبیاتی کوردی)دا بە هەردوو بەرگەکەیەوە، لەبەر دوو هۆکار:

ا- پانتایی لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەکانی لە دوانەکەی تر فراوانتر و زانستییانەتر و قووڵترە و وەک دەردەکەوێت، کەم تا زۆریش سوودی لە تاقیکردنەوەی تر وەرگرتووە، خودی خۆیشی بەهرە و ئاستی زانینی لەوان باڵاتر بووە لەم بوارەدا.

ب- بە هەردوو بەرگەکە 24 شاعیری خستووەتە بەر شەنوکەوی ڕەخنەوە. دیارە ئەم ژمارەیە لەوانی تر زۆرترە، چ لە ڕووی ژمارەی شاعیرەکانەوە، چ لە ڕووی چەندێتیی بەرهەمەکانیانەوە.

٣- بەشێکی زۆر کەم لە دابەشکردنی 24 شاعیرەکە بەسەر هەردوو بەرگەکەدا، کە بەرگی یەکەم 14 و دووەم 10 شاعیری گرتووەتە خۆ، لەسەر بنەمای شێوەیانە، واتە تازە و کۆن. دیارە لێرەوە جیاکاری لە نێوان هۆنراوەی کلاسیک و نوێدا دێتە کایەوە. بەشێکی تری دابەشکردنەکە پەیوەندیی بە میزاجی مامۆستا ڕەفیق حیلمییەوە هەیە؛ هەر بۆ نموونە، سالمی خستووەتە بەرگی دووەمەوە، کە ئەمە هێڵەکانی تازەگەری و کلاسیک لە لایەک و تەمەن لە لایەکی ترەوە دەبەزێنێ و پێچەوانە دەکەوێتەوە، بە هەمان شێوە بێخود و بێکەسی خستووەتە پێش حاجی قادری کۆییەوە، موستەفا بەگی کوردی و نالیی پەڕاندووە، کە ئەم دوانە ئێجگار دیار و بەرچاون و لەوان لەمێژینەترن. لە ڕاستیدا ئەو پرۆگرامەی کە لای بەشێک لە عەرەبەکان یان فارسەکان دەبینرێن، زانستییانە و بابەتییانەترن، وەک:

یەکەم: دابەشکردن بەپێی کات و سەردەم.

دووەم: دابەشکردن بەپێی بابەت و مەبەست، وەک هۆنراوەی دڵداری، داشۆرین، سوارچاکی و پیاهەڵدان.

سێیەم: دابەشکردن بەپێی شوێن، وەک هۆنراوە لە کوردستانی خواروو، یان ڕۆژهەڵات، یان سەروو یان خۆرئاوا ... یان.... یان بەندە گەشتووەتە ئەو بڕوا و قەناعەتەی کە ئەم دابەشکردن و ڕیزبەندییە لە هەردوو بەرگەکەدا، هەروەها پاش و پێشخستنی شاعیرەکان لەسەر بنەمای تیۆرێکی ڕەخنەیی و بڕیارێکی پێشوەختەی سیستماتیک نییە و زیاتر بە میزاج و چۆن بۆ گونجان، کارەکەی فەراهەم هێناوە. لە بەرگی دووەمدا پەیمانی داوە بە خوێنەر کە ئەگەر بۆی ڕەخسا، بەرگی سێیەمیش دەنووسێتەوە. بەڵام مخابن، کارەکەی بۆ تەواو نەکرا، با ئەوەشم لە یاد نەچێت کە خوالێخۆشبوو ڕەفیق حیلمی مەبەستی لە دانانی کتێبی (شیعر و ئەدەبیاتی کوردی)، تەنیا خزمەتکردن بووە بە میللەتی کورد و نەوەکانی داهاتوو. لە هەمان کاتیشدا نەفەوتانی بەرهەمی شاعیرەکان و ڕزگارکردنیان لە چنگ لەناوچوون. ئەم جوامێرە هەموو تواناکانی تەرخان کردبوو بۆ میللەتی کورد، تەنانەت لە حکومەتەکەی مەلیک مەحمودیشدا ڕۆڵی ڕۆشنبیرێکی پێشکەوتنخواز و زانستپەروەری بینیوە و هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدا بووە کە حوکمدارێتیی کوردستان بەرەو دنیای خۆرئاوا و شارستانێتی نوێ هەنگاو بنێت، واتە پرۆژەیەکی ڕەخنەسازیی بەرنامە بۆ دارێژراو، تەنانەت بە گەز و گرێی ئەو وەختەش لە خەیاڵیدا نەبووە، وەک بەیانی ڕوانگەخوازەکانی لەمەڕ

خۆمان، یان بەیانە شیعرییەکەی فازیل عەزاوی، یان قوتابخانە ڕەخنەسازییەکانی ئەوروپا وەک ڕۆلان بارت و هایزن و بۆدلێر و...

٤- شیعر و ئەدەبیاتی کوردی، نە بە تەنیا مێژووی ئەدەبە، نە بە تەنیا ڕەخنەی ئەدەبییە، دیارە هێڵێکی جیاکەرەوەی دیار و تۆخ لە نێوان مێژووی ئەدەب و ڕەخنەی ئەدەبیدا هەیە. ئەگەر مێژووی ئەدەب ڕەنگدانەوەی باری سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابووری، ڕووناکبیری و ژیاریی ئەو سەردەمە بێت کە شاعیری تیا ژیاوە، دیارە ئەم واقیعەش کەم تا زۆر ڕۆڵی دیاری هەبێت لەسەر پێکهاتەی هزر و داهێنان و بۆچوون و هەڵوێستی شاعیر، نەک هەر ئەمەش بەڵکو خودی سەربوردە و ژیاننامەی تایبەتی شاعیر و داهێنەر و تەنانەت باری خێزانی و سۆزداریش، ئەوا ڕەخنەی ئەدەبی شیکردنەوە و هەڵسەنگاندن و بە باڵابرنی بەرهەمی ئەدەبییە و تەنانەت دەستنیشانکردنی ئەو بەرهەمە ئەدەبییەیە، کە سەر بە چ قوتابخانە و ڕەوتێکی ئەدەبییە و تا چەند گرەوی هونەریی بردووەتەوە. نەک هەر ئەمەش، بەڵکو گەلێ جاران ڕەخنەی ئەدەبی دەبێتە داهێنانێکی تر بە ئاراستەی قووڵکردنەوە و فراوانترکردنی دەقی سەرەکی.

زۆربەی ئەوانەی کە مێژووی ئەدەبیان نووسیووتەوە، هەر لە عەلادین سەجادییەوە هەتا د. مارف خەزنەدار، د. عیزەدین مستەفا ڕەسول، عەلی باپیر ئاغا، ئەمین فەیزی، ڕەفیق حیلمی و تەنانەت لە نێو عەرەبەکانیشدا، حەنا فاخوری و تەها حسەین و زەکی موبارەک، تەنانەت بەشێک لە فارسەکانیش، ئەم دوو بوارە، واتە مێژووی ئەدەب و ڕەخنەیان لە ئاستی ناوکۆییدا تێکەڵ کردووە. بەڵام ڕێبازی کارل بروکلمان لە کتێبی (تأريخ الادب العربى) لە هەموو ئەوانەی لای عەرەب و تەنانەت کوردەکانیش ئەکادیمییانەتر و بابەتییانەتر و پسپۆڕییانەترە. تەنانەت ئەوانەی لای خۆمان توخمە ئەدەبییەکانیشیان تێکەڵ کردووە و دۆ و دۆشاو بەسەر یەکدا ترشاوە، ئەم دیاردەیە لای خۆرئاواییەکان بە شێوەی لای خۆمان نییە و هەست بەو تێکەڵاوییە چرووپرە ناکرێت؛ هەر بۆ نموونە، بڕوانە کتێبی (نظرية الادب)ی تۆستان دارین و ڕینیە ویلک-ی ئینگلیز و (نظرية الادب)ی ڕووسەکان، هەست بە تایبەتمەندی و پسپۆڕییەکی باڵا دەکەیت. خۆ کە کتێبی (مبادئ النقد الادب)ی ڕیتشارد دەخوێنیتەوە، هەست بە پسپۆڕییەکی ئێجگار باڵا دەکەیت و هیچ جۆرە تێکەڵبوونێک هەست پێناکەیت، ئەگەر تێکەڵاوبوون لە نێو بابەتەکاندا لای نەوەی یەکەم هەبووبێت، نە ئەبوو لای د. عیزەدین و د. مارف خەزنەدار ئەو دیاردەیە بە زەقی ڕەنگ بداتەوە.

خوێنەر هەر کە چاوی بە ناونیشانی کتێبەکە، واتە (شیعر و ئەدەبیاتی کوردی) دەکەوێت، دڵی بە تەنیا چەکەرە بۆ تۆمارکردنی چەند دەقێکی ئەدەبی کوردی دەکات و هیچی دی! بەڵام دوای موتاڵا و خوێندنەوە، بابەتی مێژووی ئەدەب و سەربوردەی ژیاننامەی شاعیر و دەقی ئەدەبی و چەردەیەک ڕەخنەش! واتە ناونیشانی کتێب و بابەتەکانی، چوونیەک نین، ئەم دیاردەیە بە لادان لە مەنهەجی ئەکادیمی وێنا دەکرێت، چونکە هەمیشە ناونیشانی بابەت دەرگایە بۆ چوونەناو ماڵی مەبەست.

٥- مامۆستا ڕەفیق حیلمی، ئەمین فەیزی و ئەمین زەکیی بەگشتی لە ڕیزی شاعیران داناوە و بە گەرمی باسی بەرهەمە شیعرییەکانیان دەکات. بەڵام هەتا ئێستا ئەم دوو جوامێرە لە نێوەندی ئەدەبی کوردیدا بە هەرچییەک ناسرابن، بە شاعیر

ڕەفیق حیلمی

نەناسراون، بەندە نازانێت ئەم ڕایە لە چ بنەوانێکەوە سەری هەڵگرتووە؟ دەشێت ئەم دوو بەڕێزە وەک هەر ڕووناکبیرێک لە چەند بۆنەیەکدا شیعریان وتبێت، بەڵام لە کۆتاییدا لەسەری نەڕۆشتوون و وەستاون، ئەمین زەکی باوەشی گەرمی بۆ مێژوو کردووەتەوە و بووەتە کۆڵەکەیەکی قەفئەستووری مێژوونووسینی کوردی، ئەوی تریشیان لە بواری زانستدا هەنگاوی گورج و خێرای هەڵهیناوە.

٦- هەندێک جار مامۆستا ڕەفیق حیلمی لە دەرگای مەبەستێک دەدات کە نایپێکێ؛ هەر بۆ نموونە، دەفەرموێت هەردوو ئەحمەد واتە ساحێبقڕان و موختار جاف (هەردووکیان کە بەهرەیەکی گەورە و بڵندی شاعیرییان بووە، لە سەرچاوەی فتری زەکای خۆیان و موحیێ ئەدەبی سلێمانی بەولاوە لە هیچ سەرچاوەیەکی عیلم و ئەدەبی بێگانە، نسیبەداری فەیز و هونەر نەبوون) ، بەڵام لە واقیعدا هەردوو شاعیر کەم تا زۆر زمانی فارسییان زانیوە، تەنانەت ئەحمەد موختار بە حوکمی ئەوەی پەرلەمانتار بووە لە بەغدا، عەرەبییەکی باشی زانیوە، دیارە ئەم سوودبینینە لە زمانی بێگانە هێڵی بەهرەی خۆرسکی ئەم دوانەی نەبەزاندووە ئەگەر زیادی نەکردبێت! تەنانەت هەر خودی مامۆستا ڕەفیق حیلمی نموونەی هۆنراوەی (گوڵی خوێنین)ی ئەحمەد موختاری هێناوەتەوە و فەرموویەتی "ئەحمەد موختار بەگ لە زمانی بێگانەیشەوە شیعرێکی زۆر بەرز و ڕەنگینی بۆ کردووین بە کوردی و بەم ڕەنگە هێز و توانای شاعیریی خۆی و فەساحەت و بەلاغەتی زمانی کوردی خستۆتە بەرچاو" . دیارە ئەمە بەڵگەی سوودبینینیەتی لە ئەدەبی بێگانە، واتە بەهرەی فیترەتی شاعیریەت بە ڕووناکبیری شیعری کەم ناکات ئەگەر زیاد نەکات!

٧- مامۆستا ڕەفیق حیلمی لە زۆر بۆنە و جێگەدا سەرزەنشتی هەندێک شاعیر دەکات، چونکە بابەتی نیشتمانییان بەرهەم نەهێناوە و هەر بە باڵای یاردا هەڵیان داوە. ئەو بە ئەڵهاوە لە ڕوانگەی

نیشتمانپەروەرێتیی خۆیەوە داوای بیری نەتەوەیی و کوردایەتی و شیعری بەرەنگاری دەکات و بە وەعز و نەسیحەت شاعیرەکان دائەگرێتەوە، واتە داوای (الادب الملتزم)یان لێدەکات و ئەم جۆرە ئەدەبەش بەشێکە لە پەیام و خواست و خولیاکانی، ئەوەی کە لێرەدا دەبێت بوترێت، گرنگ ئەوە نییە چی دەڵێیت، گرنگ ئەوەیە چۆنی دەڵێیت! واتە بەشێک لە توخمی شاعیریەت ئەوەیە کە شیعرەکە جوان و دلۆڤان و ڕەسا بێت و مەرجە بنەڕەتییەکانی شیعریەتی بەرهەم هێنابێت، واتە مەرج نییە هۆنراوەیەکی نیشتمانی لە ڕووی هونەر و شیعریەتەوە سەرکەوتوو بێت، ئایا هۆنراوەی (جق و نقی) گۆران لە ئاستی (شیوەنی هیوا) کەیایەتی؟ با ئەوەشم لە یاد نەچێت کە بەها و پێوانەی خواستە ڕەخنەییەکان ڕێژەیی و بەپێی زەمان و زەمین گۆڕانکارییان بەسەردا دێت، تەنانەت خودی چێژی ئەدەبیش حاڵەتێکی ڕێژەییە و لە خوێنەرێکەوە بۆ خوێنەرێکی تر دەگۆڕێت و ناچێتە یەک قاڵبەوە و دەورانی زەمەن کاریگەریی لەسەر داناوە.

٨- لەگەڵ ئەوەی کە ڕەفیق حیلمی گرنگی فرەی بە ناوەرۆک داوە، بەڵام هەرگیز پشتی نەکردووەتە شێوازی دەربڕین و بە تەواوکەری ناوەرۆکی داناوە و نەشیویستووە دوور بێت لە هەڵسەنگاندنی لایەنە ئیستاتیکییەکان، وەک دەردەکەوێت، شارەزاییەکی زۆر لە بواری زانستی ڕەوانبێژیدا (بلاغة) هەبووە، تەنانەت ئەم زانستەشی کردووەتە ئامرازێکی کارا بۆ شیکردنەوەی هۆنراوەکان و بەباڵابرینیان.

ڕەفیق حیلمی

9- زۆرجار شیکردنەوە و تاوتوێکردنی چامە شیعرییەکانی بە خوێنەر سپاردووە و خۆی لێ لاداوە، بە بۆچوونی بەندە، مەبەست لەم دیاردەیە:
یەکەمین: کورتبڕی و دوورکەوتنەوەیە لە درێژەدان بە ڕاڤەی دەقەکان.
دووەمین: گرنگیدانە بە ئەهەمییەتی خوێنەر لە کردەی ئەدەبیدا، چونکە پێکهاتەی هەموو کردەیەکی ئەدەبی بریتییە لە: (داهێنەر، داهێنراو، خوێنەر) یان وەرگر، دیارە پشتگوێخستنی خوێنەر، کردە ئەدەبییەکە شکست پێدەهێنێت، تەنانەت هەندێک تیۆری ئەدەبی، بەپێی بیردۆزی (نظرية الاستقبال)، خوێنەر دەکەنە کۆڵەکەی کردەی ئەدەبی، هەروەها بەپێی بۆچوونەکانی ڕەخنەگری فەرەنسی ڕۆلان بارت، خوێنەر لە ڕێگای هێرمۆنیکاوە دەق دەوڵەمەند و فرەمەودا دەکا و بایەخەکەی زیاتر دەکات.
١٠- زۆربەی ئەو نموونە شیعرییانەی کە مامۆستا ڕەفیق حیلمی خستوویەتیە شیعر و ئەدەبیاتی کوردییەوە، لە ڕوانگەی دەسبژێرییەوە (إنتقائی) بووە، واتە چ دەقێکی بە دڵ بووبێت و پێی سەرسام بووبێت، پەخشی کردووە و خستوویەتیە ژێر تیشکی شیکردنەوە و نرخاندن و باسی لێوە کردووە.
١١- بۆچوونە ڕەخنەییەکانی مامۆستا ڕەفیق حیلمی لە ڕەخنەی گشتییەوە (النقد العام) نزیکن، چونکە شیکردنەوە و هەڵسەنگاندنەکانی پەلی بۆ بواری جوانناسی و ڕەوانبێژی و شێوەسازی و واتا و وشەئارایی کێشاوە و بەپێی پێویست چارەسەری دەقەکانی کردووە، ناتوانم ئەوە بسەلمێنم کە ڕەخنەی گشتگیر سەد دەر سەد لە هەموو دەقەکاندا ڕەنگی داوەتەوە، چونکە لە هەندێ شوێندا ڕەخنەی (إنطباعی) یان ناوەرۆکگەرایی یان (تفسیر)ی بۆ بەرهەم هێناوین، ئەوەی کە لێرەدا جێگەی مەبەستە، ئەوەیە کە مامۆستا ڕەفیق حیلمی سەرەتایەکی مژدەبەخش و ڕووناکی لە ڕەخنەی ئەدەبیدا چێ کردووە.

١٢- هەندێک جار مامۆستا ڕەفیق حیلمی بەراوردی لە نێوان دوو شاعیردا کردووە، وەک حەمدی ساحێبقڕان و ئەحمەد موختار جاف، یان گۆران و شاعیرەکانی پێش خۆی. ئەم بەراوردە ناچێتە خانەی ئەدەبی بەراوردەوە (الادب المقارن)، چونکە بەراوردەکە لە نێوان دوو کەسدایە، کە بە یەک زمان شیعر دەڵێن، دیارە مەرجی ئەدەبی بەراورد بەپێی هەردوو قوتابخانەی فەڕەنسی و ئەمریکی ئەوەیە کە دەبێت بەراوردەکە لە نێو دوو زمانی جیاوازدا بێت. بە بۆچوونی بەندە، خودی بەراوردەکە جێگای سەرنجە و گەرەکە لەم بوارەدا لایەنەکانی بەراوردکراو لێک نزیک بن، بۆ دەرخستنی توخمە جیاوازەکان، یان نزیکەکان. با ئەوەشم لە یاد نەچێت کە قاڵب و تێکست و دنیای شاعیرێتییەکەی حەمدی ساحێبقڕان جیاوازترە لە ئەحمەد موختار جاف. تەنیا ئەوەی کە ئەم دوانە لێک نزیک دەکاتەوە، ڕەخنەگرتنە لە سەردەمی حوکمدارێتیی شێخ مەحمودی نەمر، بەڵام لە دوو هەڵوێستی جوامێرانەی دڵسۆز و بەتەنگەوەهاتوو بۆ شێخ و حوکمدارێتییەکەی.

١٣- مامۆستا ڕەفیق حیلمی لە نێو ئەو 24 شاعیرەدا، ئێجگار سەرسامە بە عەلی باپیر ئاغا (کەمالی) و گۆران و زۆرترین پانتایی بۆ تەرخان کردوون و زۆر بە وردی و فراوانی و سەرکەوتوانە ئەم دوو شاعیرەی نرخاندووە و لە جێگای شیاوی خۆیان دایناون، ئەم دیاردەیە ئەو بەڵگەیە دەسەلمێنێت، کە مامۆستا ڕەفیق حیلمی چێژی تایبەت و (إنطباعی) سەرپشک کردووە بۆ بەشێک لە توێژینەوەکانی؛ هەر بۆ نموونە، لەسەر وەسفی هەورامانەکەی گۆران زۆر وەستاوە و ئێجگار پێی سەرسام بووە و بە بەرزترین نموونەی شیعری تەسویری ناوزەدی کردووە. هەر لە پەراوێزی شیکردنەوەی هۆنراوەکانی گۆراندا ئەوەی درکاندووە، کە کانیی شاعیرێتیی گۆران دوای ناسین و بە دواداچوونی ئەدەبی تورکیی نوێ و خوێندنەوەی بەرهەمەکانی (شوعەرای فەجری تازە)ی وەک تۆفیق فیکرەت و نامیق کەمال هاتووەتە گۆڕێ و وەک هەندێک شاعیر لە ڕەوتی شیعروتن نەکەوتووە و پێبەپێ و سات دوای سات شیعرەکانی بەرەو پێش چووە و لە شکۆفەدا بووە. نەک هەر ئەمە، بەڵکو لە هەموو مەبەست و بابەتە شیعرییەکاندا سەرکەوتوو بووە، سەبارەت بە شێخ نوری شێخ ساڵحیش، دەڵێت: (نوری شاعیرێکە تەجەدود پەروەر ئەڵقەیکە ئەمسەر و ئەوسەی چەمەری شاعیرەکانی چەرخی پێشووی لەگەڵ شاعیرەکانی ئەم چەرخەدا هانیوەتەوە یەک، لە شیعری کلاسیکی بەشێکی زوبدەی وەرگرتووە و لە سەلیقەی ئەدەبی تۆزێک فیتری و تۆزێکیش ئیرسی خۆی خستۆتە سەر...) .

١٤- مامۆستا ڕەفیق حیلمی لە بواری گرنگیدان بە ئەدەبی نوێ، پێش سەردەمەکەی کەوتووە و بانگ بۆ تازەکردنەوەی ئەدەبی نوێ دەدات، شێوە و داروباری ئەدەبی کۆن ئەفەرۆز دەکات. ئەوەتانێ دەفەرموێت (ئەم چەشنە شیعرانە ئیتر باویان نەماوە -دیارە مەبەستی هۆنراوەی کۆنە- و نابێ ئیمە بگەڕێینەوە سەری و بیکەینەوە بە باو، بەڵکو ئەبێ ئوسلوبێکی تازەی بۆ دابنێین و بە شێوەیەکی وا لە نیشتمان بدوێین کە لەگەڵ پێویستی ئەم چەرخە بێ و شانبەشانی شارستانییەتی بڕوا)، واتە تازەگەریی بەستووەتەوە بە پێشکەوتنی شارستانیەتەوە و ئاوێنەیەکی باڵانمایەتی.

١٥- دەشێت کتێبی (شیعر و ئەدەبیاتی کوردی) باشترین بەرهەمی سەردەمی خۆی بێت لە بواری شیکردنەوە و بەباڵابڕین و نرخاندنی ئەو دەقانەی کە بەهای جیاجیای خۆیانی بۆ داناون.

# ڕەفیق حیلمی و سەرەتای ڕەخنەی زانستی لە ئەدەبی کوردیدا

**ئومێد ئاشنا**

دەتوانین بە بەڵگەوە بیسەلمێنین، کە ڕەخنەی هاوچەرخ و زانستی لە ئەدەبی کوردیدا لە ڕەفیق حیلمییەوە دەستی پێ کرد. بڵاوبوونەوەی شیعر و ئەدەبیاتی کوردی بەرگی یەکەم ساڵی (١٩٤١) بزوتنەوە و گۆڕینی تەواوی خستە ناو جیهانە کپ و کۆنەکەی ڕەخنەوە. بە جۆرێک ئەو پێوانە و بۆچوون و کەرەسە ڕەخنەگریانەی لەو کتێبەدا هاتبوە ناوەوە نەک بۆ ئەو سەردەمە، کە چل و چوار ساڵ لەمەوپێش دەکات، بەڵکە هەندێکیان ئێستاش بەکاردێن و ڕەخنەگر دەبێت لە نزیکەوە شارەزایان بێت. باری ڕەخنەی ئەدەبی کوردی پێش دەرچونی شیعر و ئەدەبیات نووسین و بۆچوونی ئەوتۆی تێدا نەبوو کە شیعری شاعیرە کوردەکان لێک بداتەوە و هەڵیان بسەنگێنێ و نرخی فیکری و هونەری خۆیان بداتێ. ئەو هەوڵانەی کە هەبوون بەلای ئێمەوە لەلایەن چوار کەسەوە خرابوونەڕوو.
هەوڵی یەکەم زنجیرە نووسینەکەی شێخ نووری شێخ ساڵح لە (ژیان)دا ساڵی – ١٩٢٦ لە ژمارە (٢٠) بەناوی (ئەدەبیاتی کوردی) – ئەم زنجیرە نووسینەی شێخ نووری تایبەت نەبوو بە هەڵسەنگاندن و

نرخاندن و ڕەخنە لێ گرتنی بەرهەمی شاعیرێک یاخود ڕێبازێکی ئەدەبی یاخود قۆناغێکی ئەدەبی کوردی بەڵکە بریتی بوو لە باس کردن و نمونە بۆهێنانەوە بە شیعر بۆ یاسا گشتیەکانی شیعر لە ڕووی شێوە و ناوەڕۆکەوە. ئەم بەرهەمەی شێخ نووری ئەگەرچی زۆر لەوەی ڕەفیق حیلمی کۆنترە لە ڕووی مێژووەوە و نرخی تایبەتی خۆی هەیە بەڵام لە ڕووی کارتێکردن و تایبەتیەتی شیعری کوردی و لێکدانەوەی بەرهەمی شاعیرە کوردەکان وەک شتێکی تیۆری و گشتی مایەوە.

شێخ نووری لەو زنجیرە نووسینەدا دیارە پشتی بە چەند سەرچاوە و کتێب بەستبوو چونکی نووسینەکە خۆی باسی زانست و یاسا گشتیەکانی شیعر و ئەدەب دەکەن، ئەو سەرچاوانەش کوردی نەبوون، بەڵام بەداخەوە نووسەر ناوی سەرچاوەکانی نەبردوە.

هەوڵی دووەم لەلایەن - ڕەشید نەجیب -ەوە بوو. ئەمیش بە زنجیرە وتارێک کە نزیک بوو لە مەبەستەکانی زنجیرە وتارەکەی شێخ نووری لە ڕۆژنامەی ژیان - دا ساڵی - ١٩٢٨ - دەستی کرد بە بڵاوکردنەوەیان.

هەوڵی سێیەم لەلایەن پیرەمێرد-ەوە بوو، ئەمیش هەروەک ئەوەی کە لاسایی شێخ نووری و ڕەشید نەجیب -ی کردبێتەوە لە ڕۆژنامەی ژیان دا ساڵی - ١٩٣٢ - بە زنجیرە چەند نووسینێکی دەربارەی یاسا گشتی و بنەڕەتیەکانی شیعر و ئەدەب بڵاوکردەوە و تایبەت نەبوو بە ڕەخنە و هەڵسەنگاندنی شاعیرانی کورد.

هەوڵی چوارەم لەلایەن عەلی باپیر ئاغا - ی شاعیرەوە بوو لە کتێبی - گوڵ دەستەی شوعەرای هاوعەسرم - دا ئەم کتێبە لە دوو لایەنەوە تەماشا دەکرێت:

لایەنی یەکەم ئەوەیە وەک ئەو زنجیرە نووسینانەی باسمان کرد دەربارەی شیعر و ئەدەب ئەم زانستی نەبوو وە هیچ سەرچاوەیەکی بۆ بەکارنەهێنابوو تەنها بیر و لێکدانەوە و چێژی شیعر و شاعیریەتی خۆی نەبێ.

لایەنی دوەم کە ڕێگای سەرکەوتنی بۆ خۆش کردوە و جێگەی سەرنج دانە ئەوەیە کتێبەکە تایبەتە بە شیعری چەند شاعیرێکی ناسراو و ناوداری کوردی ئەو ڕۆژگارە. بە چەند ڕستەیەکی کورت وەک پێشەکیەک باسی ساڵی لەدایک بوون و پلەی خوێندن و جۆری وەزیفەتی شاعیرەکان دەکات و بە دوو سێ ڕستە ڕادەی شاعیریەتیان هەڵدەسەنگێنێت ئەوەندەی کە خۆی لە شیعر و ئەدەب و بەرهەمی ئەو شاعیرانە گەیشتبێ ئینجا یەک دوو شیعری شاعیر بۆ نمونەی شاعیریەتیان دەنووسێت.

ئەم کتێبەی عەلی باپیرئاغا ساڵی (١٩٣٩) بڵاوبوەوە و وەک پێشوو دوو ساڵ پێش بڵاوبونەوەی کتێبی شیعر و ئەدەبیاتی ڕەفیق حیلمی بوو. ئەگەر بێت و بەراورد بکەین لە نێوان کتێبی - گوڵ دەستەی - عەلی باپیرئاغا و شیعر و ئەدەبیاتی ڕەفیق حیلمی لە هەموو ڕوویەکەوە ئەوا نیسبەت لە نێوانیاندا نیە چونکە - گوڵ دەستە - دانانرێت بە لێکۆڵینەوە و ڕەخنە سەبارەت بە شیعری ئەو شاعیرانەی باس کراوە بەڵکە تەنها چەند بیروڕایەکی تاکەکەسی ڕاگوزاریە.

ئەگەرچی هەر لە ساڵی - ١٩٢٦ -ەوە کە ڕۆژنامەی - ژیان - دەرچووە هەتا ساڵی - ١٩٤٧ - کە شیعر و ئەدەبیاتی کوردی بڵاوبوەوە ناوبەناو پیرەمێرد لەو ڕۆژنامەیەدا باسی شاعیرێک یاخود نووسەرێکی دەکرد وەک نالی و حەمدی و مەحوی و شێخ ڕەزا و گۆران. بەڵام ئەم لێدوان و لەسەر نووسینانەی پیرەمێرد "جگە لە نووسینەکەی لەسەر گۆران و حەمدی" ئیتر هەموویان بەبۆنەی لەچاپدانی دیوانەکانیانەوە بووە.

ئەو نووسینانەی پیرەمێرد ناچێتە ڕیزی ڕەخنە و لێکۆڵینەوەی بەرهەمی شاعیرەکانەوە و زیاتر باسکردنی شاعیرەکەیە نەک شیعرەکانی.

ئینجا لەم کپی و مەنگی و دەگمەنی ڕەخنەیەدا

ساڵی (١٩٤١) کتێبی شیعر و ئەدەبیاتی کوردی کەوتە بەرچاوی ئەدیبان و خوێنەرانی ئەدەبی کوردی، بووە جێی ڕەزامەندی و بایەخ و لەلایەکی تریشەوە هەر لە یەکەم ڕۆژەوە بووە سەرچاوە بۆ هەر نووسەرێک ویستبێتی سەبارەت بە شیعر و ئەدەبی کوردی بنووسێت. لەدوای ئەمەش پاش تێپەڕینی پانزە ساڵ بەسەر دەرچونی بەرگی یەکەمی شیعر و ئەدەبیاتی کوردیدا واتە ساڵی ١٩٥٦ ڕەفیق حیلمی بەرگی دوەمی شیعر و ئەدەبیاتی کوردی بڵاوکردەوە.

ئەمجارەیان وەکو ڕەخنەگرێکی پێگەیشتو و دەوڵەمەند بە ڕۆشنبیری ڕەخنەیی و کەرەسە زیندوەکانی ڕەخنە هاتە پێشەوە. بەم کارە نەمر و گەورەیە ڕەفیق حیلمی بوە سەرەتای ڕەخنەی زانستی لە ئەدەبی کوردیدا. بەمە ماڵی ئەدەبی کوردی ئاوەدان کردەوە و مێژووی ڕەخنەی ئەدەبی کوردی ئاوەدان کردەوە و مێژووی ڕەخنەی ئەدەبی بۆ دەستنیشان کردین. ئێستا دەتوانین بڵێین مێژووی ڕەخنە لە ئەدەبی کوردیدا مێژوویەکی دوور و کۆن نیە بەلای منەوە وەک بە بەڵگەوە لەم نووسینەدا دەی سەلمێنین لە بڵاوبونەوەی بەرگی یەکەمی شیعر و ئەدەبیاتی ڕەفیق حیلمییەوە دەستی پێ کرد وەک لە سەرەتادا وتمان دەکاتە چل و چوار ساڵ لەمەوپێش.

بەرگی دوەمی ئەم کتێبە گەلێ جیاوازی هەبوو بە بەراورد لەگەڵ بەرگی یەکەمدا. لە بەرگی دوەمدا هەڵسەنگاندنە ڕەخنەییەکانی نووسەر زانستیتر و مەوزوعیتر دەردەکەون. هەر سێ لێکۆڵینەوەکەی دەربارەی شێخ نووری و گۆران و دڵدار سەلماندی کە ڕەخنەی ئەدەبی کوردی شان بەشانی نوێ بوونەوە و داهێنانەکانی جیهانی نوێی شیعری کوردی لەرێگادان. لە ڕێگەی شیعرەکانی دڵدار و شێخ نووری و گۆران-ەوە قۆناغی وریابونەوە -ڕاپەڕین - النهضة - و نوێ بوونەوە - التجدید - ی لە ئەدەبی کوردیدا دەست نیشان کرد. نووسەر بەمەوە نەوەستا و ساڵی (١٩٥٨) لە گۆڤاری - پێشکەوتن و - شەفەق -دا دەستی دایە نووسین سەبارەت بە مێژووی ڕەخنە بەگشتی و ڕەخنەی ئەدەبی کوردی بەتایبەتی بە زنجیرە ئەم هەوڵە نەمرەی پەرە پێدا. لێکۆڵینەوە پڕ بایەخ و زانستیەکەی بە ناوی - ئینقیلاب لە شیعری کوردی[1] -دا - کە ساڵی ١٩٥٨ لە گۆڤاری - پێشکەوتن -دا بڵاوی کردەوە بووە رابەرێکی زانستی بۆ هەموو ئەوانەی دەیانویست لە مەسەلەی نوێبونەوەی شیعری کوردی بگەن. بەرگی یەکەمی شیعر و ئەدەبیاتی کوردی باسی چوارده شاعیر دەکات، نووسەر ئوسلوبێکی تایبەتی خۆی گرتوە و کردویەتیە بەرنامەیەکی ڕەخنەیی و لە بەرگی دوەمیشدا هەمان بەرنامەی بەکارهێناوە، ئەویش باس کردنی کەسێتی شاعیرەکەیە لە سەرەتادا و جا لێکۆڵینەوە و ڕەخنە سەبارەت بە شیعرەکان. نووسەر لە پێشەکی کتێبەکەیدا مەبەستی خۆی لەو نووسینانە ئاشکرا دەکات و دەڵێت [ئەم چەند لاپەڕەیە کە ئاوێنەیەکە - صورەت و سیرەتی - هەندێ لە شاعیرە ناودارەکانی کوردستانی عێراق بە وێنەی دەسکەگوڵێکی ڕەنگاوڕەنگ و بۆن خۆش دەرئەخا کە هەر گوڵێکی لە باخێک هەڵ بژێررابێ پێشکەش لاوانی کورد و بەتایبەتی پێشکەشی ئەو قوتابیە خۆشەویستانە ئەکەم کە لە قوتابخانە بەرزەکاندا ئەخوێنن و لەوێدا لە شیعر و ئەدەبیاتی کورد شتێکیان بەرچاو ناکەوێت. ئەگەر بەم - سیپارە - بچوکە توانیبێتم کە گیانی - ڕۆحی - ئەدەبی ئەوان بجوڵێنمەوە،

1 ئینقیلاب لە شیعری کوردیا- ڕەفیق حیلمی. گۆڤار- پێشکەوتن- ژمارەی یەکەم ساڵی یەکەم شوباتی ١٩٥٨.

ڕەفیق حیلمی

هەر تەقەلایەک کە بۆ پێک هێنان و وەدەرهێنانی بەرگی دوەم ئەیدەم لەلام سوک ئەبێ و گیانی نیشتمان پەروەریم تازە ئەبێتەوە][2].

لێرەدا نووسەر چوار مەبەست دەست نیشان دەکات:

١ – مەبەستی ئەوەبووە شیعر و ئەدەبی کوردی وەک هەر یەک لەو بابەتانەی لە زانکۆکاندا قوتابیانی کورد بە دەرس دەیخوێنن ئەم بەرهەمەی ئەویش بتوانێ وەک یەکێک لەو دەرسانە لە زانکۆدا بخوێنرێ. بەمەش دیارە قوتابی کورد لە مێژووی زمان و ئەدەبی میللەتەکەی شارەزا دەبێ کە زمان و ئەدەبیش یەکێکە لە خاسیەتە بنەڕەتیەکانی بوونی هەر میللەتێک.

٢ – نووسەر ویستویەتی بەو کارە گیانی ئەدەبی لەو خوێنەر و قوتابیانەدا دروست بکا و گەشەی پێ بدات چونکە دیارە کە گیانی ئەدەبی لە هیچ ڕۆژگارێکدا لە گیانی نەتەوە و خۆشی و ناخۆشیەکانی لە ئازار و ئاواتەکانی جوێ نەبۆتەوە.

٣ – ئەم کارە لای ئەو دەبێتە نوێبوونەوە و بەگوڕبوونەوەی ئەو گیانی نیشتمان پەروەریەی کە هەر لە سەرەتای تەمەنەوە نووسەر خولیای بوە و لە ناخیدا ژیاوە.

٤ – ئەو کتێبە سەرەتا و ڕێ خۆش بوونێک بووە لای نووسەر بۆ نووسینی بەرگی دوەم. ئەوەبوو ساڵی – ١٩٥٦ – بەرگی دوەمی چاپ کرد.

ئەگەر مەرگ مۆڵەتی بدایە نیازی وابوو بەرگی سێیەمیش لەم کتێبە بەنرخە بنووسێت و بڵاوی بکاتەوە. نووسەر دەڵێت "هەوڵ ئەدەین کە ناوبەناو چەند بوێژێک لەناو ئەمانەی کە باسیان کراوە بەتایبەتی لەوانەی دیوانێکی لەچاپ دراویان نیە و یا شتێکیان دەربارە نەنوسراوەتەوە هەڵبژێرین و نامیلکەی سێهەمی لێ ڕێک بخەین"[3].

ئەمە دەربارەی پێشەکی بەرگی یەکەم و لە پێشەکی بەرگی دوەمیشدا گەلێ زانیاری بەسوودی بۆ تۆمار کردوین و ڕایەکی گرنگ دەربارەی دەوری ئەدەب لە گۆڕان و پێشکەوتنی کۆمەڵدا دیاری دەکات و دەڵێت:

"بوێژەکان و ئەدیبەکانی کورد بەرامبەر بە قەومی خۆیان پێویستیەکی گەورەیان لەسەرە، مێژوو لە دواڕۆژ لەناو وێژە و وتارەکانی ئەوانا بۆ هۆی دواکەوتن و، پێشکەوتنی کورد ئەگەڕێ"[4]

ڕەفیق حیلمی ویستویەتی بڵێ – ئەدەب ئاوێنەی میللەتە – شاهێدی ڕاست گۆی ئەو سەردەمەیە کە تیایدا لەدایک دەبێ. لەلایەکی کەی پێشەکیەکەدا چەند زانیاریەکی نوێمان پێشکەش دەکات ئەویش ئەویش ناوهێنانی چەند شاعیرێکی هاوچەرخە کە ڕۆڵێکی دیاریان لە ئەدەبی کوردیدا بینیوە و هەندێکیشیان دەستیان لە نوێکردنەوەی شیعری کوردیدا هەبوە و نووسەر باسی ئەوەدەکات کە ئەمانە لە شاعیرە بەرزەکانن و بەڵام پێویستی بە کەسانی دڵسۆز و شارەزا هەیە کە بەرهەمیان بدۆزێتەوە و بیانخاتە ڕوو چونکە تا ئەوکاتەی نووسەر ئەمەی نووسیوە بەرهەمیان زۆر و کەم بگرە نادیار بووە و بەداخەوە هەتا ئێستاش چ وەک کتێب و یاخود لە گۆڤار و ڕۆژنامە کوردیەکاندا هیچ شتێک دەربارەی ئەم شاعیرانە نەنووسراوە و شیعریان لە کونەچی تاریکی لەبیرچونەوە و ونبوندا ماونەتەوە، نووسەر دەڵێت:

"ڕەشید قادر ئاغا – برا بچوکی مەحمود ئەفەندی قادر ئاغای ڕەئیسی پێشووی بەلەدیەی سلێمانی بوە. بە لاوی و لەکاتی شەڕی گەورەی یەکەمدا ئەمری خوای کرد"[5]. ڕەفیق حیلمی ناوی ئەم شاعیرانەی لە ڕیزی نالی و مەحوی و هجری و شێخ ڕەزا و مەولەویدا نووسیوە هەروەها ناوی ئەم شاعیرانەشی نووسیوە کە بەداخەوە بیرچوونەتەوە و شیعریان دیار نیە و نووسەر لە ڕیزی شاعیرە – تازە و تجدد پەروەرەکاندا ناویان دەبات. ئەمەش ناوی ئەو شاعیرانەیە و تکایە هەر ڕۆشنبیرێک شیعری ئەمانەی لەلا هەیە لە بڵاوکردنەوەیان درێغی نەکات چونکە سامانێکی

2 شیعر و ئەدەبیاتی کوردی ڕەفیق حیلمی. بەرگی یەکەم ١٩٤١.

3 شیعر و ئەدەبیات بەرگی دوەم ل٦

4 هەمان سەرچاوە. پێشەکییەکەی

5 هەمان سەرچاوە. پێشەکییەکەی

گرنگی ئەدەبیمانە:
١ – مستەفای شێخ سەلام.
٢ – سەعید فەوزی.
٣ – ئەورەحمان بەگی نفوس.
٤ – بێباک.
٥ – شارەزووری.
تەنانەت نووسەر سەبارەت بەم شاعیرانە پێ دادەگرێت و دەڵێت "هەموو شاعیرن و هەندێکیان لەوانەن کە ئەشێ بەتایبەتی نامێلکەیەکیان دەربارە بنووسرێتەوە"[6].
ئەمجا کە تەماشای سەرانسەری نووسین و ڕەخنە و لێکۆڵینەوەکانی نووسەر دەکەین لە ڕادەی ڕۆشنبیریی ڕەخنەیی و توانای سەلماندنی زانستی بە بەڵگە و چۆنیەتی بڕیارەکانی تێدەگەین. ئەوەی ئاشکرایە هەر ڕەخنەگرێک بەرنامەی ڕەخنەیی خۆی هەیە و کەرەسەی ڕەخنەگریەکەی ڕادەی ڕۆشن بیریەتی. ڕەخنەگر کاتێ باسی شیعر دەکات لە دوو لایەنەوە لێکی دەداتەوە یەکەمیان لایەنی ستاتیکی شیعرەکە و کاری هونەرکاری و سەلیقەی شاعیر، لایەنی دوەم بابەتی شیعرەکە و جۆری بیرکردنەوەی شاعیرەکەیە.
سەبارەت بە لایەنی یەکەم با تەماشای ئەم واتا و وشانە بکەین کە ڕەخنەگر بەکاری دەهێنا و هەریەکە لە جێگای خۆیدا دادەنا وەک ئەم وشە و واتایانە "وەسف، شعوری قەومی، فەلسەفەی ژیان، کلاسیک، ڕۆمانتیک، واقیعی، سنعەت، مەقسود، الضروره المقبول، نعت، سەلیقەی ئەدەبی، شیعری چیرۆک، تەفکیری عەسر، نظم، نثر، تجدد پەروەر، زەهراوی شارستانیەت، بۆدەقەی ئەدەبی، حورت و سیرت، تعلیل، تشبیه و إستعاره، جناسی تام، صدر و عجز، الاصوات المتألفه، الأصوات المتنافره".
دەربارەی لایەنی دوەمیش هەمیشە هەوڵی داوە ڕادەی بیروباوەڕی نەتەوایەتی خۆی واتەی – فکری قەومی – لە شیعری شاعیرەکاندا بدۆزێتەوە و دەست نیشانی بکات. بۆ نمونە دەربارەی (ئەسیری) شاعیر دەڵێت: "تا ئێستە ئێمە توشی شیعرێکی غرامی نەبوین و لەمەش وا دەرئەکەوێت عەشقی وڵات ئەوی کردەوە بە شاعیر ئەگینا لەبەرئەوە نیە کە شاعیر بێ و ویستبێتی پەیرەوی شاعیرانی عەسری بکا و شیعری نیشتمانیش بڵێ"[7] هەروەها سەبارەت بە – بێخود – دەڵێت:
"بەڵام ئێمە بێخودمان بۆ ئەم نەوعە شیعر و سەناعەتانە ناوێ و نامانەوێ کە ئیتر وەسفی زولف و پرچمان بۆ بکا وە یا مەرسیە بۆ مردوو بنووسێتەوە حەتا ناشیانەوێ هەر بە مەدحی پێغەمبەرەوە خەریک بێ و بۆ ئاخیرەتی هەوڵ بدا بەڵکو هیوامان وا پێیەتی کە ماوەی عومری خۆی سەرفی دیوانێکی عەسری و تازە بابەت بکا بۆ شیعری بەرز و ڕەنگینی نیشتمان پەروەرانە"[8].
ڕەفیق حیلمی لەو ڕۆژگارەدا پەیوەندی دیالێکتێکی نێوان شێوە و ناوەڕۆک دەدۆزێتەوە. شیعرەکانی حاجی قادری کۆیی دەکات بە نمونەی پێکەوەبەستنی تەکنیکی هونەری لە شێوەدا و بیری بەرز لە ناوەڕۆکدا. لە ئەنجامدا دەیسەلمێنێت کە بابەت و ناوەڕۆک چەندە گرنگ و لە بیرێکی بەرزەوە هەڵ قوڵابێ ئەگەر تەکنیکێکی نوێ و لەباری لەپێناودا ساز نەکرێت ئەوا نابێتە شیعر و شیعریش بێت لاواز دەردەچێت. نووسەر دەڵێت "ئەگەر لەبەر ئەهمیەتی گیان –ڕوح– مادەی ئیهمال نەکردایە و بە تەنگ ڕازاندنەوەی ئەو شیعرانەوە ببوایە زۆر بە ئاسانی ئەمەی بۆ دەچوە سەر و ئەیتوانی بیانخاتە وێنەیەکی

ڕەفیق حیلمی

6 هەمان سەرچاوە

7 شیعر و ئەدەبیات. بەرگی یەکەم. باسی ئەسیری شاعیر.
8 شیعر و ئەدەبیات. بەشی یەکەم باسی بێخودی شاعیر

جوانتر و بەرزتری ئەدەبییەوە. بەڵام وەک وتمان حاجی مەبەستی شیعرداڕشتن نەبوە و فکر داڕشتن بوە[9]. نووسەر سەرەتای بەرگی یەکەمی کتێبەکەی بە – حەمدی بەگی ساحێب قڕان دەست پێ دەکات، وەک ڕەخنەگرێکی وریا شیعرەکانی حەمدی دەکات بە سێ بەشەوە، وەسف و شعوری قەومی و فەلسەفەی ژیان. نووسەر باسی وردی بیر و چوانی – تشبیە – دەکات لە شیعرەکانی حەمدیدا، کە ئەمە سەرەتای بەهرە و هەڵچونی دەسەڵاتی ڕەخنەگرانەی ئەو بون بە هۆی ئەوەی کە زمانی تورکی و فارسی باش زانیوە. لە هەمان کاتدا هەندێ جار ڕەخنەیەکی بەراوردکاری دروست کردوە لە نێوان شیعری شاعیرانی کورد و فارس یاخود کورد و تورک. بەڵام لەم بیروڕایەدا ڕەخنەگر نیشانی نەپێکاوە کە وەها دەزانێت حەمدی و ئەحمەد موختار بێ ئاگا و نەشارەزابوون لە ئەدەبی نەتەوەکانی دەوروپشتیان وەک عەرەب و تورک نەیانتوانیوە سوود لە شیعری شاعیرانی ئەم نەتەوانە وەربگرن. بەڵێ ڕاستە توانا و بەهرەی زاتی هەر شاعیرێ هۆی یەکەمە بۆ ڕادەیە شاعیریەتی بەڵام زۆر شاعیرمان هەن ئەگەر کاریگەری ئەدەبی گەلانی تر نەبوایە و زمانیان نەزانیایە ئەو شاعیرەیان لێ دەرنەدەچوو. حەمدی و ئەحمەد موختاریش بێبەش نین لە کاریگەری نەک شاعیرانی تورک و هی دی بەڵکە کاریگەری شاعیرانی کلاسیکی کوردی پێش خۆشیان لە سەرە و لە شیعرەکانیاندا بە ئاشکرا دیارە.

ڕەفیق حیلمی ڕەخنەگر پاش ئەوەی زۆربەی شیعری کلاسیکی کوردی دەخوێنێتەوە لە دیاردەیەکی بایەخدار و تا ئەو کاتە شارراوە دەدوێ ئەویش ئەوەیە کە زۆر لە شاعیرە کلاسیکیە کوردەکان وەک لە ئوسلوبدا لاساییان کردۆتەوە لە مەسەلەیەکی گرنگی ناوەڕۆکیشدا هەر لاساییان کردۆتەوە ئەویش مەسەلەی دڵداری کردن و عاشق بوونە کە زۆریان عاشق نەبوون و ئافرەتێکی تایبەتی لە ژیانیاندا نەبووە و عەشقەکەیان هەر خەیاڵی بووە. نووسەر دەڵێت:

"من لام وایە ئەغلەبەی شاعیرە کۆنەکانمان هەروەکو شیعرەکانیان لاسایی کردنەوە بووە لە عەشقیشدا هەر مقلدبوون و ڕەنگە بەشی زۆریان مەعشوقیان نەبووبێ و بە خەیاڵ بووبن بە عاشق".

نووسەر لێرەدا شتێکی لەمە گرنگتری بیرچووە ئەویش ناوهێنانی وشەکانی مەی و شەرابە لە شیعرە کلاسیکیەکاندا. دەرکی بەوە نەکردوە کە زۆربەی شاعیرە کوردەکانی پێشوو مەی و ساقی و جامی بادە و شەرابیان باس کردوە. ئەگەرچی هەندێکیان وەک مەحوی و مەولەوی کە سۆفی بوون ساقیان بە شێخ داناوە و جامی مەیش بە بادەی ئەو عەشقە واتە وەرگرتنی وەعز و تەریقەت، بەڵام بەگشتی مەیخۆر نەبوون و هەندێکیشیان ڕەنگە نە شەرابیان دیبێ و نە شێوەی ساقی. نووسەر سەبارەت بە شیعرەکانی پیرەمێرد گەلێ بیروڕای زانستی و ڕەخنەگرانەی نووسیوە بەڵام لەتەک ئەمەشدا کەوتۆتە دوو هەڵەی دیارەوە. یەکەم، بەڕای ئەو پیرەمێرد لاسایی هیچ شاعیرێکی نەکردۆتەوە. دوەم ویستویەتی ببێ بە ڕێبەری شاعیرەکانی سەردەمی خۆی. نووسەر دەڵێت

"پیرەمێرد هەروەکو لە شیعرەکانیا لاسایی کەسی نەکردۆتەوە بەڵکو ویستویەتی کە خۆی ببێ بە ئیمامی شاعیرە کوردەکانی ئەم عەسرە، لەلایەکی تریشەوە لە شیعرا کوردی پەتی تاقی کردۆتەوە و بۆی دەرخستووین کە زمانەکەمان زمانێکی دەوڵەمەند و شیرینە"[10]. بۆ وەڵام دانەوەی ڕای یەکەمی دەڵێین، ئەگەر بێت و ئەو شیعرانە لە دیوانی پیرەمێرد دەربهێنین کە تیایدا لاسایی نالی و مەولانا خالید و مەولەوی و بێسارانی و وەلی دێوانە و شامەزهەر و گەلێکی تریشی کردۆتەوە ئەوا ژمارەیەکی کەم لەو شیعرانە دەمێننەوە کە لاسایی کەسی تێدا نەکردبێتەوە. دەربارەی

9 هەمان سەرچاوە باسی حاجی قادری کۆیی

10 شیعر و ئەدەبیات بەرگی یەکەم باسی پیرەمێرد

کاریگەری نالی و مەولەوی پیرەمێرد خۆی دەڵێت: "هەتا مەولەویم نەناسیبوو نالی لەلام پێغەمبەری شیعری کوردی بوو"[11] تەنانەت زۆر بەیتی شیعری مەولەوی و بێسارانی لە شیعرەکانیدا بە ئاسانی دەناسرێتەوە. لە ماوەی ئەو بیست و پێنج ساڵەی لە تورکیا بووە نەک لاسایی شاعیرە تورکەکانی کردۆتەوە بەڵکە بە تورکی و فارسی گەلێ شیعری لە گۆڤاری – ژین – و – ڕۆژنامەی – کورد – و – إقدام – و – شەفەق سورخ – و – فەرهەنگ– دا بڵاوکردۆتەوە. سەبارەت بە لاسایی کردنەوەی مەولەوی دەبێ ئەوە لەبیرنەکەین کە پیرەمێرد ئەوەندەی شێوەی کێشی شیعری مەولەوی – کێشی خۆماڵی – لەلا شیرین بوە ئەوەندە چێژی لە حاڵەتی ڕۆحی شیعرەکانی مەولەوی وەرگرتوە. بۆ وەڵام دانەوەی ڕای دوەمیش دەڵێین، پیرەمێرد هەرگیز بیری لەوە نەکردۆتەوە کە ئاڵای پێشڕەوی شیعری نوێ هەڵنەگرێ بەڵکە زۆرجار لە ڕۆژنامەی – ژین –دا کە شیعری خۆی بڵاودەکردەوە دەینووسی ئەمە – منظومە –ی حاجی توفیق –ە نەی دەگوت – شیعر – وە دەینوسی – کاتێ شاعیر بووم، یاخود دەینووسی شاعیرێک وەختی خۆی ئەمە نووسیوە. لەلایەکی تریشەوە وەک خۆی زۆرجار نووسیویە هەمیشە (گۆران)ی لە خۆی بە شاعیرتر زانیوە ئەمەش لە ڕووی – تواضع –وە نەبوە بەڵکە ڕاستیەکەی هەر وابووە و ئەو دەورەی گۆران لە نوێکردنەوەی شیعری کوردیدا لە هەموو ڕوویەکەوە بینیویەتی پیرەمێرد نەیبینیوە. پیرەمێرد زیاتر گرنگی بە وشە و واتای کوردی پەتی داوە نەک شێوەی داڕشتنی نوێ. زۆرجار بە پێچەوانەوە گەڕاوەتەوە بۆ دواوە و ڕێچکە و ئوسلوبی نالی و بێسارانی و مەولەوی و وەلی دێوانەی گرتۆتە بەر. هەتا ئێستا باشترین و کورتترین بیروڕا بەلای منەوە بۆ هەڵسەنگاندنی دەوری پیرەمێرد بیروڕای – گۆران –ە. دەڵێت "ئەو ئەی هێنا وشە کوردیە نەبیستراوەکانی بڵاوئەکردەوە – ئەوانەی بەکارهێنانیان زۆر فراوان نیە. وشە کوردیەکان وەک ناوی گژ و گیا و گوڵ و شتی تر. بێگومان ئەم کردەوەیەش تەئسیری هەر هەبوو، بێ کەڵک نەبوو. تەئسیرەکەشی لەلایەن إحساساتی نەتەوایەتیەوە بوو نەک لەلایەن هونەرەوە، کە خەڵکی هان ئەدا کوردی پەتی بنووسن ئەگینا زۆرجار وشەی فارسی و عەرەبی ڕەقی بەکارئەهێنا و لێیان نەئەسڵەمیەوە"[12]

ڕەفیق حیلمی ڕەخنەگر لەیەک کاتدا دوو شاعیری بە پێشڕەوی نوێ کردنەوەی شیعری کوردی داناوە. واتە پیرەمێرد و گۆران. سەبارەت بە پیرەمێرد ڕونمان کردەوە کە پێشڕەوی شیعری نوێی کوردی نەبووە. سەبارەت بە گۆران دەنووسێت "گۆران لە دنیای شیعرا ئینقیلابێکی گێڕا و بەڕاستی بناغەیەکی تازەی بۆ شیعری کوردی دانا. بوو بە سەرکردەی هەرە ناوداری بوێژانی دەوری وریابوونەوە"[13]

بەڵام ڕەفیق حیلمی لێرەدا دەوری خۆی وەک شاعیرێک و دەوری شێخ نووری لەبیرچووە کە خۆی و شێخ نووری بەرەی بناغەی شیعری نوێیان دانا. با گوێ لە گۆران بگرین چۆن باسی ڕەفیق حیلمی و شێخ نووری دەکات "لەم بابەتەوە ڕەنگبێ ڕەفیق حیلمی پێش – نووری – کەوتبێ، بە کوردی و تورکی شیعری بڵاوکردۆتەوە تەنانەت شاعیرێکی تر – عبدالرحمن بەگی نفوس – لە سەرەتای ژیانی شاعیریەتیدا زۆر بەگوڕ دەستی

ڕەفیق حیلمی

ڕۆڤار



11 ڕۆژنامەی ژین ژمارە (٧٨٩) ساڵی ١٩٤٦

12 دانیشتنێک لەگەڵ گۆران. گۆڤاری بەیان ژمارە (٢) ساڵی ١٩٧٠

13 ئینقلاب لە شیعری کوردیا پێشکەوتن ژمارە یەک ساڵی ١٩٥٨

دایە تازەکردنەوەی هەڵبەست وە لە نووری کۆنترە بەڵام ئەو شیعرەکانی بڵاونەئەکردەوە ئەگەرچی عبدالرحمن لەدوایی ژیانیا لە هەڵبەستەکانیا تطوریکی نەکرد و وەستا"[14] عبدالرحمن بەگی نفوس و ڕەفیق حیلمی و شێخ نووری هەرسێکیان لە شیعر نووسیندا لەپێش گۆران -ەوە دەستیان پێ کردەوە شێخ نووری بەلای گۆرانەوە - سەرۆک - بووە، هەتا خولیای گەرمی شاعیریی هەبوو هەر بە سەرۆک دانراوە بەڵام شێخ نووری ساردبوەوە و گۆران ئاڵاکەی گرت بە دەستەوە و گەیاندیە ئامانج. کەواتە هەتا ئەو کاتەی کە شێخ نووری بەگوڕ بووە خۆی دەوری سەرۆکی هەبوە و جێدەستی خۆی دیاری کردوە. ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کاتێ ئەو لەو گەرمی و گوڕیە دەکەوێ ئیتر لەو قۆناغە مێژووییەدا کە دەوری تێدابینیوە و بەدان پیانانی گۆران کە سەرۆک بووە ئێمە دەوری سەرۆکی شیعری کوردی لێ وەرگرینەوە. نووری شێخ ساڵح بەلای ڕەفیق حیلمییەوە شاعیرێکی - مخضرم - هەبووە. وە بەتەنیا خۆی دەورێکی تایبەتی بینیوە. ئەمجا واتای "دەورێکی تایبەتی دەنوێنێ" لە واتاکەی گۆران نزیک دەبێتەوە کە بە سەرۆک دابنرێت بەڵام ڕەخنەگر هێشتا نیشانی نەپێکاوە.

ڕەفیق حیلمی بۆ بەڵگەی بیروڕاکانی خۆی سەبارەت بەوەی کە شێخ نووری نەیتوانی سەرکردەیی شیعری نوێی کوردی بگرێتە دەست، سێ بەڵگە دێنێتەوە و منیش لای خۆمەوە بە بەڵگە ئەو سێ بیروڕایە ڕەت دەکەمەوە، ئەگەرچی ڕەنگە هەندێ کەس بەم بیروڕایانەی من قایل نەبن.

ڕەفیق حیلمی سێ بەڵگە دێنێتەوە کە شێخ نووری نەیتوانیوە دەوری سەرکردەیی لە شیعری نوێی کوردیدا ببینێ:

١ - "نووری لەگەڵ ئەوەشا کە ئەڵقەی بە یەکەوە نووسانی دەورەکانی کلاسیکی و وریابونەوەیە - نهضە - ڕەنساس لەڕاستیا خۆی دەورێکی تایبەتی ئەنوێنێ، دەستە قوتابیەکی ئەو توی شوێن نەکەوت و یا پێی نەگەیاند کە دەورێکی وا بنوێنن بشێت بخرێتە مێژووی ئەدەبی کوردەوە"[15].

٢ - نووری و دەوری نووری یەکێکە واتە هەر خۆی بوو.

٣ - ئەمەش وا ئەگەیەنێت تەرانەکانی نووری کە شوێن - توفیق فکرت -ی بوێژی ناوداری تورک کەوتبوو وە لاسایی ئەوی ئەکردەوە لەگەڵ چەشتنی - زەوق ی - کورد ڕێنەئەکەوت لەبەرئەوە موریدانی نەبوو. ئینقیلابێکی پێ نەکراو بیرچووەوە"[16]

لە وەڵامدا بەرامبەر ئەم سێ خاڵە دەڵێین:

١ - ڕاستە شێخ نووری شاعیرێکی - مخضرم - بووە لە دەوری کۆن و نوێدا شیعری هەبووە بەڵام بەهۆی ئەوەی ژمارەیەکی زۆری لە ڕۆژنامەی ئەو سەردەمەدا بڵاودەکردەوە مورید و قوتابی و شوێن پێهەڵگری زۆر بوو. گەلێ شاعیری شوێن کەوت و لاساییان دەکردەوە.

٢ - نووری و دەوری نووری تەنیا شێخ نووری نەبوو بەڵکە ڕەفیق حیلمی و عبدالرحمن بەگی نفوس و ڕەشید نەجیب و گۆران بوو. بەڵام لەوکاتەدا شێخ نووری بەهۆی بڵاوبونەوەی شیعرەکانی و ڕادەی ڕۆشن بیریی هاوچەرخانە و کارتێکردنی ئەدەبی تورکی وەک سەرۆکی ئەم ڕاپەڕین و نوێ بونەوەیە دەرکەوت.

٣ - بەپێچەوانەی ڕەخنەکەی ڕەفیق حیلمییەوە من دەڵێم شیعرەکانی شێخ نووری بۆیە برەوی پەیداکرد و پەرەی سەند چونکە لەگەڵ زەوقی کورددا ڕێدەکەوت و برگەی کێشی خۆماڵی بەکاردەهێنا و بۆ کوردی پەتیش خۆی دەدا لە بێژنگ. بۆیە شێخ نووری توانی لە قۆناغێکی تایبەتی و لە ساڵانی بیستدا ئینقیلابی شیعری بکات و هەرگیز لە بیر نەچێتەوە. وەک بینیمان گۆران پلەی ڕابەر و سەرکردەی ئینقیلابەکەی داوەتێ. ڕەفیق حیلمی هەر لە بارەی گۆران -ەوە دەڵێت "گۆران

14 دانیشتنێک لەگەڵ گۆران. بەیان ژمارە (٢)- ١٩٧٠

15 ئینقلاب لە شیعری کوردیدا. پێشکەوتن ژمارە یەک ١٩٥٨

16 هەمان سەرچاوە

بەم ئینقیلابە قوتابخانەی شاعیرە کۆنەکانی بەتەواوی ڕوخاندوە و دنیای شیعری کلاسیکی بەجاریّ سەرەوژێر کردوە"[17] لێرەدا نووسەر ویستویەتی بڵێ گۆران شۆڕشێکی نوێخوازی بەرپاکرد و لە دەستوری کلاسیکیەکان یاخی بوو لە باسی ڕۆمانتیکیەتی گۆراندا ڕەفیق حیلمی زۆر بە شارەزایی دەنووسێت "ئەو زیاد لە شاعیرەکانی تر مەفتونی تەبیعەتە وە بە نیگایەکی قوڵتر تێی ئەفکرێ. بەڵام لە لایەکی تریشەوە هەست بەوە ئەکا کە جوانی ئافرەت کانگای هەموو جوانیەکی تەبیعەتەوە بە ئیلهامی جوانیی ئافرەت هەست بەوە ئەکرێ کە لە تەبیعەتا جوانی هەیە. لە ئافرەتیشا گۆران بۆ ئەو جوانیانە ئەگەڕێ کە بە دەست ناگیرێ وە (بوون)یان لە کانگەی دڵ و گیانا هەست ئەکرێ"[18] ڕەخنەگر مۆسیقای شیعرەکانی گۆران بە مۆسیقایەکی ڕۆژئاوایی دەزانێت دەڵێت "یەکێک لە مۆسیقای خۆرهەڵاتیەکانی کۆن بەولاوە مۆسیقای نەبیستبێت و گوێچکەی هەر بەم جۆرە مۆسیقایە ڕاهاتبێت و گوش کرابێ ڕەنگە لەم مۆسیقا تازەیە کە لە شیعرە تازەکانی گۆراندا هەیە تامێکی ئەوتۆ وەرنەگرێ"[19] ڕەفیق حیلمی زیرەکانە ئەوە دەدۆزێتەوە کە گۆران هونەرمەندێکی ڕیالیزمە و دەڵێت: "گۆران بەڕاستی بوێژێکی واقیعی و فەننانە بوێژێکە مادەی شیعرەکانی لە کانگای ژیان واتە لە ژیانی کۆمەڵایەتی کورد هەڵێنجاوە"[20] نووسەر لە نووسینەکەیدا سەبارەت بە

17 هەمان سەرچاوە
18 شیعر و ئەدەبیات. بەرگی دوەم ١٩٥٦
19 هەمان سەرچاوە
20 هەمان سەرچاوە

گۆران باسی ئاواز و نەرمیی مۆسیقای وشە دەکات کە ئەمە بەلای منەوە بە تاقی کردنەوە و هەوڵی یەکەم دەزانرێ لە دنیای ڕەخنەی کوردیدا هەر لەو شیعرانەدا دەنگە پێک نەهاتوەکان – الأصوات المتنافره – جوێ دەکاتەوە.

ڕەفیق حیلمی ڕەخنەگر یەکەمین نووسەر کوردە لەدوای پیرەمێردی نەمرەوە کە ئەدەبی بەراوردکاری – الأدب المقارن –ی وەک تیور و پراکتیک ئەنجام دەدات. ئەویش کاتێ شیعری موستەزادی جلوەی شانۆی گۆران و موستەزادی – بهاردە –ی – توفیق فکرەت–ی شاعیری تورک بەراورد دەکات و ئەدەبێکی بەراوردکاری دروست دەکات. نووسەر سەبارەت بە هەردی وەهای نووسیوە کە لە شیعرەکانیان پەیڕەوی گۆران دەکات، ڕەخنەگر سەبارەت بە بێکەس چەند بیروڕایەکی تۆمارکردوە و دەڵێت "لە شیعردا ڕێگەیەکی عەسری گرتوە یەعنی لە ئینقیلابی شیعری کوردیدا هەنگاوێکی زلی هێناوە"[21] بەڵام ئەگەر ئێمە شیعر هەڵسەنگێنین وەک شیعر و هونەرەکانی شیعر بێکەس بەوە دەناسین کە شاعیرێکی شۆڕشگێڕی نەتەوەکەی بووە و شیعر لای ئەو بۆ هەژاندنی کۆمەڵانی خەڵک و خۆپێشاندان و نواندنی هەڵوێستی ناڕەزایی دژی داگیرکەر و زۆردار گرنگی بە جوانکاری و ڕازاندنەوەی شیعرەکانی نەداوە و لە بەکارهێنانی وشەی عەرەبیشدا سڵی نەکردۆتەوە. بەکورتی شیعر لای ئەو مەبەستێکی تایبەتی خۆی هەبوە و ئەو زیاتر بیروباوەڕی شۆڕشگێڕی و بەرەنگاربوونەوەی مەبەست بوە و لەبەرئەوەی شیعر خۆش ئاوازترە و زۆرتر خەڵکی دەتوانن تێی بگەین و لەبەری بکەن و بیڵێنەوە ئەم لە ڕێگەی شیعرەوە بیروڕاکانی دەربڕیوە وەک حاجی قادی کۆیی "مەبەستی شیعر داڕشتن نەبوە بەڵکە فکر داڕشتن بووە –"[22] ڕەخنەگر دەربارەی – ڕەمزی مەلا مارف –ی

21 گۆڤاری شەفەق ژمارە (٥– ٦) ساڵی ١٩٥٨
22 شیعر و ئەدەبیات بەرگی یەکەم ل١٢

شاعیر دەڵێت "نە پشتی کردۆتە تازە و نە ڕووی لە کۆن وەرگێڕاوە. ڕەمزی گاهێ لە قاڵبێکی تازەدا مەوزوعێکی کۆن و گاهێ لە قاڵبێکی کۆنا مەوزوعێکی تازە ئەهۆنێتەوە"[23]

ڕەخنەگر لە بەرگی یەکەمی شیعر و ئەدەبیاتدا زیاتر ئوسلوبی ڕەخنەی شیکردنەوە – تحلیل –ی بەکارهێناوە و شیعرەکانی لە ڕووی مانا و ڕازاندنەوەی وشە و واتاوە لێک داتەوە، بەڵام لە بەرگی دوەمدا کە چواردە ساڵ دوای ئەمە لە چاپ دراوە ڕەخنەگر ئوسلوبێکی زیاتر ڕوون و زانستی ڕەخنەیی بەکارهێناوە. شێوەی ڕەخنەی مەوزوعی و واقیعی و هونەری زاڵە بەسەر شێوەی ڕەخنەی – تحلیل –ی دا. نووسەر بەم کتێبە توانی ببێتە یەکەمین ڕەخنەگر لە ئەدەبی کوردیدا کە بە ڕێ و شوێنی زانستەوە مامەڵە لەگەڵ شیعری شاعیرە کوردەکان بکات.

ویستویەتی دەسەڵات بەرزی ڕادەی داهێنان و بیری نەتەوایەتی و هەستی ئیستاتیکی شاعیرەکان ڕوون بکاتەوە و بیسەلمێنێ.

لەتەک ئەمانەشدا ئەوەی جێی سەرنجی ئێمەیە ئەوەیە ڕەخنەگر بەرنامەیەکی ڕێک و ڕەوانی سەبارەت بە ڕێک خستنی ناوی شاعیرەکان ڕەچاو نەکردوە. بۆ نمونە لە بەرگی یەکەمدا ناوی چواردە شاعیری نووسیوە یەک لەدوای یەک لێکۆڵینەوەی ئەدەبی لەسەر نووسیون. لەکاتێکدا پیرەمێرد و حاجی قادر و خاکی شاعیر بە ڕیزی یەکەوە باس دەکات کە سەردەمی ژیانیان دەیەها ساڵ و بگرە نزیکەی سەد ساڵ زیاتریش لە یەکەوە دوورن. سەردەمی حەمدی و پیرەمێرد و بێکەس یەک سەردەمە و زۆر دورە لە سەردەمی ژیانی حاجی قادر و ئاهی و خاکی و خەستە. لە بەرگی دوەمیشدا دیسان سالم و گۆران پێکەوە باس دەکات، دیارە سەردەمی ژیانیان چەندە دورە لەیەکەوە.

هەروەها لە بەرگی یەکەمی شیعر و ئەدەبیاتدا باسی ئەمین زەکی بەگ دەکات وەک شاعیرێک کە

23 شیعر و ئەدەبیات بەرگی دوەم ١٩٥٦

هەموو دەزانین ئەمین زەکی بەگ شاعیر نەبوە و مێژوونووس بووە.

ڕەفیق حیلمی لە بارەی شیعری کۆنی – ڕەمزی –یەوە دەڵێت:

"ئەم چەشنە شیعرانە ئیتر باویان نەماوە و نابێ ئێمە بگەڕێینەوە سەری و بیکەینەوە بە باو. بەڵکو ئەبێ ئیتر ئوسلوبێکی تازەی بۆ دابنێین بە شێوەیەکی وا لە نیشتمان بدوێین کە لەگەڵ پێویستی ئەم چەرخە ڕێک بکەوێ"[24]

ئەم بیرکردنەوە هاوچەرخ و مرۆڤانەیەی ڕەفیق حیلمی بانگ کردنێکی ئاشکرایە بۆ هونەر و ئەدەبی مولتەزیم، مولتەزیم بە مەسەلەی میللەتەوە. نووسەر کاتێ داوای ئەو جۆرە هونەر و ئەدەبە مولتەزیمەی کرد خۆی یەکێک بوو لە ئەدیبە مولتەزیمەکان. ئەگەر بە وردی تەماشای ژیانی بکەین بۆمان دەردەکەوێت سەرانسەر خۆشەویستی میللەت و خەباتی بێ وچان بووە بۆ پێشکەوتنی میللەتەکەی هەر لەوکاتەوە کە بە تورکی شیعری بۆ کورد وتووە و دوای شیعری کوردی وتووە و کە ڕۆژنامەی – ئومێدی ئیستیقلال – دەردەچوو وە ئەم ماوەیەک سەرنووسەری بووە خزمەتی ئەدەب و مێژووی کوردی کردوە. خۆی دەنووسێت "ئەو شیعرانەی کە بە تورکی دامئەنا هەمووی بۆ کورد بوو فەریادی کوردستانی تیا ئەبیسترا"[25] ڕەفیق حیلمی لە هەموو کارە ئەدەبی و مێژووییەکانیدا ویستویەتی پەیامێکی گەورە و پیرۆز بگەیەنێ بە میللەتەکەی. ویستویەتی هۆیەکانی ناکۆکی و دواکەوتن و پشێوی میللەتەکەی لە ڕووی ئەدەب و مێژووەوە ڕەنگ پێ بداتەوە و وەک بەردی بناغەی ڕەخنەی زانستی کوردی دانا هەموو هەوڵێکیشی تەرخان کرد بۆ ڕەنگ ڕشتنی ئەدەبی دواڕۆژ، ئەدەبی مولتەزیم بە مەسەلەکانی میللەتەوە.

24 هەمان سەرچاوە. باسی ڕەمزی مەلا مارف.

25 پاش تەموز- ڕەفیق حیلمی- ١٩٥٨- پێشەکی.

# لەنێوان
# گۆران و ڕەفیق حیلمیدا

ئومێد ئاشنا

**"چاوی تاسەی بە شوێنا هەر ئەگێڕێن**
**لە ئاسمانا چونکە جێی چۆڵ ئەبینین"[1]**

کە لاشەی ڕەفیق حیلمی بە گردی سەیوان سپێررا، گۆران بە شیعرێکی جوان شیوەنی دڵی خۆی و ماتەمیی گیانی نووسیەوە. شیعری – ئاوابونێک –ی بۆ نووسی. گۆران توانی لای خۆیەوە بە بیست و دوو دێڕ سەرلەنوێ ڕەفیق حیلمی بە نەتەوەکەی و هەموو کەس بناسێنێتەوە.
لەنێوان گۆران و ڕەفیق حیلمیدا یادداشت و نامە و شتێک لەم بابەتانەمان بەدەستەوە نییە هەتا بیکەین بە نموونە و بتوانین وەک سەرچاوەیەک گەلێ ڕۆشنایی بخەینە سەر گیانی ئەدەبی ئەو سەردەمە و لە نزیکەوە ئاگاداری پێشکەوتن و هەستی کەسی و تایبەتی شاعیر و ڕەخنەگر بین.
سەبارەت بە پەیوەندی نێوان گۆران و ڕەفیق حیلمی – ئەوەی بەدەستەوە بێت و لای زۆربەمان دیارە لێکۆڵینەوەکەی ڕەخنەگرە کە لە بەرگی دوەمی شیعر و ئەدەبیاتی کوردیدا هەیە. وە ئەو نووسینەش کە لە گۆڤاری – پێشکەوتن –دا بە ناوی – ئینقیلاب لە شیعری کوردی – دا بڵاوکردەوە. لەوێدا دەوری هەریەک لە گۆران و شێخ نووری دەرخست و وەک ڕەخنەگرێکی لێهاتوو ئەو کێشەی تازەکردنەوە و ئینقیلابە شیعریەی شی کردەوە.
ئەوەی کە – گۆرانیش بەرانبەر ئەم هەوڵانەی نووسەر کردبێتی تەنها شیعری – ئاوابونێک –ە. لە سەرەتاوە باسمان لێ کرد. وە سەرەتای شیعرەکە بەم جۆرە دەست پێئەکات و پێویستی بە لێکدانەوە و

1 شیعری– ئاوابونێک– گۆران.

ڕوون کردنەوە نییە. شیعرێکی سادە و ڕەوان و پڕمانا و مەبەستە:

**"ئەی سەیوانی ئارامگەی ڕابووردومان**
**پێت سپێررا کۆستی تازەی کەوتومان**
**لەو کۆشەدا کە خاکی نیشتمانە**
**گۆشەی سنگی نازداری کوردستانە**
**با تێر بنوێ ئەو ئەستێرەی کە بە شەو**
**بە شەوی کورد نەچوە چاوی یەک تک خەو"**[2]

ئیتر بەم جۆرە ئەڕوات و دێتە سەر باسی ئەرک و کاری مەردانەی نووسەر لە بواری تێکۆشان و نووسیندا.

گۆران شیعری وەهای لەخۆوە و بەزۆر نەوتوە، هەتا کاریگەری ئەو کارەساتە لە ناخیدا نەتەقیبێتەوە ئازارێکی سەخت و پڕ ئێشی نەدابێتێ نەیتوانیوە بیکات بە شیعر. شیعریش لای گۆران کائینێکی ئەوەندە گەورە و پیرۆز بوە کە خەلق کردن و موعامەلە کردن لەگەڵیدا هەر وا ئاسان و سەرپێیی نەبووە.

ئینجا سەبارەت بەوەی کە "ڕەفیق حیلمی" لەبارەی گۆران -ەوە کردبێتی کارێکی ئەوەندە سەرنج ڕاکێش و بایەخدارە کە ئەتوانین بڵێین:

ئەگەر بێت و ڕەفیق حیلمی لە بوونی ڕەخنەی واقیعی - بە مانای ڕەخنە -ی ئەدەبی کوردی داببڕین ئەوا ئەو سەرەتایەمان لێ ون ئەبێت کە ڕەخنەی واقیعی و مەوزوعیانەی ئەدەبی کوردی لێوە دەست پێئەکات.

ڕەفیق حیلمی - یەکەمین کەس بوو بەو شێوە هونەری و ئەدەبیە بتوانێ لە شیعری گۆران بکۆڵێتەوە و نرخی ڕیالیزمانە و ئیستاتیکانەی خۆی بداتێ. لێرەدا گرنگی کارەکەی ڕەفیق حیلمی بەم چەند خاڵە دیاری ئەکەین.

١ - نووسەر لە سەرەتای نووسینەکەیدا لایەنی پێگەیشتن و کەسایەتی گۆران -ی فەرامۆش نەکردوە سەبارەت بە ساڵ و شوێنی لەدایک بوون و چۆنیەتی گەورەبوونی شاعیر لە کام دەور و پشتدا و ئەو گۆرانانەی بەسەریدا هاتوە نووسیویەتی جگە لەمە باسی بنەماڵەی گۆران -ی کردوە و شیعری ئەوی دەست نیشان کردوە.

٢ - لە قۆناغەکانی پێشکەوتن و ڕێبازەکانی شیعری ئەوی کۆڵیوەتەوە لە سەرەتادا باسی قۆناغی دەوری کۆن -ی شیعری شاعیر ئەکات. ئەو ڕوون ئەکاتەوە کە هەرچەندە گۆران لەسەر ئوسلوبی کۆن شیعری وتوە بەڵام کەمتر لاسایی کردۆتەوە و لە ناوەڕۆکی شیعرەکاندا وەستایەتی خۆی پێوە دیارە و سەلیقەی شاعیرانەی پرشنگی داوە.

لەپاشدا دێتە سەر دەوری گۆران لە تازە کردنەوەی شیعر و ئەو شۆڕشەی لەو بوارەدا بەرپای کرد. [گۆران لە دنیای شیعر] ئینقیلابێکی گێڕا و بەڕاستی بناغەیەکی تازەی بۆ شیعری کوردی دانا بۆ بەسەرکردەی هەرە ناوداری بوێژانی دەوری وریابونەوە.[3]

نووسەر لەم ڕووەوە کەرەسە تازەکانی شاعیری بەرچاو خستوە وەک وشە، کێش - دارشتن - قافیە - جوان ناسی - وێنەگرتنی هونەری سروشت.

٣ - یەکەم کەس بووە لە ڕەخنەی ئەدەبی کوردیدا لایەنی ئیستاتیکی شیعری گۆران شی بکاتەوە، زیرەکانە باسی کاریگەری - جوان -ی کردوە لە شیعرەکانیدا. بەتایبەتی جوانی ئافرەت. وە هەر لە دەقی شیعریی گۆران خۆیەوە گەیشتۆتە ئەو ئەنجامەی کە - جوانی - مایەی خەم بووە بۆ گۆران - و هیچ جوانیەک تاسەی دڵ و ئارەزوی گیانی ئەوی نەشکاندوە. (گۆران ئیلهامی شیعری لە جوانی وەرگرتوە و لە هەموو شتێکا جوانی پشکنیوە و پەرستوە. زۆرتر جوانی ئافرەت هێلانەی شیعری وروژاندوە)[4].

٤ - نووسەر بۆ یەکەمجار دوو سیفەتی هەرە گرنگ و نەمری گۆران باس ئەکات ئەویش ڕیالیزم و هونەرمەندی - شاعیرە. [گۆران بەڕاستی بوێژێکی

---

2 هەمان سەرچاوە.

3 ئینقیلاب لە شیعری کوردی-دا- گۆڤاری پێشکەوتن. ژمارەی یەکەم. ساڵی یەکەم شوباتی ١٩٥٨.

4 شیعر و ئەدەبیاتی کوردی- بەرگی دوەم ١٩٥٦.

واقیعی و فەننانە. بوێژێکە مادەی شیعرەکانی لە کانگای ژیان واتە لە ژیانی کۆمەڵایەتی کورد هەڵهێنجاوە][5].

٥ – بەوردی لە ڕێبازی – ڕیالیزمی فۆتۆگرافی – لە شیعرەکانی گۆران –دا باسی ئەکات و نمونەیان بۆ ئەهێنێتەوە.

٦ – جۆرە ئەدەبێکی بەراوردکاری لە نێوان کاری هونەری گۆران و گەلێ شاعیرانی خۆمان و هەندەراندا پێک ئەهێنێت.

ئێمە لەکاتێکدا بە کورتی باسی ئەو لایەنە سەرکەوتوانەی لێکۆڵینەوەکانی – ڕەفیق حیلمی –مان کرد سەبارەت بە شیعری گۆران. مانای ئەوە نییە کە لایەنی ناتەواوی و کەمی و کورتی لە لێکۆڵینەوەکانیدا نەبێت. تەنانەت ئەگەر هەر لە چاوی ئەو سەردەمە خۆیەوە تەماشا بکەین ئەتوانین گەلێ لایەنی کزی و ناتەواوی ڕوون بکەینەوە لێرەدا کە دەرفەت هەر ئەوەندەیە ئەمەمان بۆ ناکرێ و هەڵی ئەگرین بۆ هەلێکی تر لە داهاتودا.

ڕەفیق حیلمی



5 هەمان سەرچاوە.

# گێڕانەوەی ڕووداوەکان لە زاری ڕاوێژکارەکەی شێخ مەحمودەوە

**مەحمود نەجمەدین**

### ئەوەی نەگوتراوە دەگوترێ

کتێبی بیرەوەری یەکێکە لەو ژانرانەی کە زۆر کەس پەنایان بۆ بردووە، هەر لە کەسایەتیی سیاسی و هونەرمەندەوە تا و ئەدیب و ڕۆژنامەنووس... زۆرجار ڕووی داوە کەسایەتییەکی سیاسی بەپێی پێوست نەناسراوە، باشتر بڵێم لە ناو خوێنەردا نەناسراو بووە. بەڵام کاتێ بیرەوەریی خۆی نووسیوەتەوە، خەڵک ناسیویێتی؛ بۆ نموونە، بەر لە بڵاوبوونەوەی ئەزموون و یاد، پشکۆ نەجمەدین کەسایەتییەک بوو زۆرتر لە ناو سیاسەتمەدارەکاندا ناسراوبوو، بەڵام کاتێ ئەزموون و یادی بەو زمان و گێڕانەوە جوانە نووسییەوە، بۆ ئێمەی خوێنەر و بۆ نەوەی دوای ڕاپەڕین

شتێکی تازە بوو، حیکایەتێکی نەبیستراوبوو، هەر بۆیە ئەزموون و یاد بوو بەو کتێبەی کە پشکۆی بردە زاکیرەی هەموو خوێنەرێکەوە. ئەم کتێبەی پشکۆ نەجمەدین دەروازەی بۆ خەڵکی دیکەش کردەوە تا بیرەورەییەکانی خۆیان بڵاو بکەنەوە. بیرەوەری وەک دواوتە، دواهەناسەی مرۆڤ، وەک دواهەمین کتێب. کتێبی بیرەوەری، کتێبی نەگوتراوەکانە، ئەوەی کە نەگوتراوە، دەگوترێ. هەندێک لەو کەسایەتییانە بە هۆی پێگەی سیاسی یاخود کۆمەڵایەتییەوە ناتوانن نهێنییەکانی ژیان و ئەزموونیان ئاشکرا بکەن و پێگەی سیاسی یاخود کۆمەڵایەتی وا دەکات کە ئەو ڕووداوە نهێنییانە لە دوای مردنی کەسایەتییەکانەوە ئاشکرا ببن. بۆیە زۆربەی ئەو کتێبانەی کە بیرەوەرین، بڵاوبوونەوەیان هۆسە دەنێتەوە. زۆر جار کەسایەتییە گەورەکان بۆ خۆیان فریای نووسینەوەی بیرەوەرییەکان ناکەون و کەسانی دی بەو کارە هەڵدەسن؛ بۆ نموونە، کەسایەتییەکی وەکو زەبیحی، کە عەلی کەریم هەستاوە بە کۆکردنەوەی بیرەوەری و زانیاری و دیدار لەگەڵ کەسایەتییە سیاسییەکانی کە لە زەبیحییەوە نزیک بوون.

هونەری نووسینەوەی بیرەوەری زۆر گرنگە، چونکە ئەوانەی بیرەوەری دەنووسنەوە، نهێنییە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی خۆیان بۆ دواهەمین کتێب هەڵدەگرن. ئەوەی بیرەوەری دەنووسێتەوە، چیرۆکی ژیانی خۆی دەگێڕێتەوە، بەڵام لە ڕێگەی ژیانی خۆیەوە ڕووداوە جۆراوجۆرەکانی سەردەمی خۆیشی باس دەکات، بەپێی کار و پێگەی ئەو کەسە، کەشی بیرەوەرییەکە دەگۆڕێ کەشێکی ئەدەبی، یان سیاسی و یاخود کۆمەڵایەتی و... خاڵێکی دیکە لە نووسینی بیرەوەریدا گرنگیی پێدراوە، ئاشکراکردنی کردەی سێکسی و چیرۆکی عەشق و ناوهێنانی بکوژ و ناپاک و لە بیرەورەیدا زۆر هاتوون و گرنگییان پێدراوە. زۆرجار ئەمە لە ڕووی سایکۆلۆژییەوە جۆرێکە لە خۆخواردنەوەی مرۆڤ، کەسایەتیی نووسەری بیرەوەری شتێک لە دڵیدایە و ساڵانێکی زۆر خۆی دەخواتەوە تا لە دوانووسینیدا دەری دەبڕێ. ئەمە هەندێک جار بۆ تۆڵەسەندنەوەیە و هەندێک جاریش بۆ نیشاندانی واقیعە. هەندێک جاریش بۆ خۆپاککردنەوەیە لە ڕووداوە نەشیاوەکان. بەگشتی، دەکرێ بڵێین خۆشترین و سەرنجراکێشترین کتێب، کتێبی بیرەوەرییەکانە.

### یادداشتی ڕۆژە ڕەشەکان

ئەم بابەتەی ئێمە لەبارەی یادداشتەکانی ڕەفیق حیلمییەوەیە، کە لە سێ بەرگدا چاپ کراوە. ئەو یادداشتانەی کە باس لە ڕۆژگارێک دەکەن، سیخناخ بە ڕووداوی سیاسی و شەڕ و داگیرکاری. حیکایەتی سەردەمی لێژبوونەوەی دەسەڵاتی عوسمانی و هاتنی دەسەڵاتێکی تازە لە تورکیا و لە دەرەوەی تورکیاش مەملەکەتی عوسمانی بەرەو بەرتەسکبوونەوە چووە. سەردەمی دەسەڵاتدارێتیی ئینگلیز هات. شۆڕشی شێخ مەحمود لە نێوان بەرداشی دوو ئیمپراتۆڕدا دوای هەوڵ و تەقەلا و تێکۆشانێکی زۆر لەبار چوو، هیچ کام لەو ئیمپراتۆڕانە بۆ کورد نەبوون، بەڵکو کورد بۆ ئەوان بوو. کورد بێئاگایانە خۆی کرد بە قوربانی بۆ ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و ئینگلیز. هەوڵی کورد لەپێناوی دەوڵەتێکی کوردیدا بووە، هەرچی دەسەڵاتی عوسمانی و ئینگلیزە، کوردیان وەک گەمەیەک بۆ بەرژەوەندیی خۆیان بەکار هێنا. لەم باسەدا دەچینە ناو چیرۆکی ئەو ڕووداوانەوە کە ڕەفیق حیلمی لە ڕێگەی یادداشتەکانیەوە بۆمان دەگێڕێتەوە، کە کورد لەو بارودۆخەدا چۆن مامەڵەی کردووە و داگیرکەرەکان چۆن وەڵامی کوردیان داوەتەوە.

### دیداری شێخ سەرەتای تێکۆشانی ڕەفیق حیلمی بوو

ڕەفیق حیلمی یەکێکە لەو کەسایەتییە گرنگانەی کە

# ڕەفیق حیلمی

لە سەردەمی شێخ مەحمودی حەفیددا دەوری گرنگی هەبووە، وەک کەسایەتییەکی سیاسی یەکێک بووە لەو سیاسەتمەدار و ڕۆشنبیرانەی کە لە شێخ مەحمودەوە نزیک بووە و ڕاوێژکاری بووە و کەسێکی خۆشەویست بووە لە لای شێخ و ئەویش بە ئەندازەیەک شێخی خۆش ویستووە، کە هیچ کەسی بە شیاو نەزانیوە بۆ شوێنی وی. ڕەفیق حیلمی سیاسەتمەدارێکی هۆشیار و وردبین و خاوەنی هەڵوێستی ئەخلاقیی خۆی بوو. ئەم پیاوە بەدەر لە سیاسەت لە بواری ئەدەب و وەرگێڕاندا کاری کردووە. لە بیروڕای سیاسیشدا هەموو کات هەڵوێستی جوامێرانەی هەبووە. هەر زوو تێکەڵ بە دنیای سیاسەت بوو، لەگەڵ ڕووداوە گەورەکاندا توشی بەریەککەوتن بووە.

ئەو کاتەی بۆ یەکەم جار شێخ مەحمود دەبینێت، گەنجێکی بیستساڵانی خوێنگەرم و شەیدای کوردایەتی دەبێ. دیداری شێخ سەرەتای خەبات و تێکۆشانی ئەم پیاوە بووە، ئەو دیدارە، دیداری متمانەی شێخ دەبێ بە ڕەفیق حیلمی. لەوێوە دەبێ بە جێی باوەڕی شێخ. لە پەیوەندیی خۆی و کاربەدەستانی ئینگلیزدا نەترسانە مامەڵەی کردووە. وەک گەنجێکی سەربڵند مامەڵەی لەگەڵ هەردوو کەسایەتی ئینگلیز "نوئێل و بێڵ" کردووە.

لە سەردەمی دووەمی حکومەتی شێخ مەحموددا ڕەفیق حیلمی دەوری جوراوجۆری بینیوە و پۆست و پلەی جیاوازی هەبووە. بە فەرمی جێگری وەزیری پەروەردە بووە. سەرنووسەری ڕۆژنامەی بانگی کوردستان بووە و پاشانیش ئومێدی ئیستقلال. مامۆستای ماتماتیک و زمانی تورکی بووە.

## چیرۆكی ململانێكان دەگێڕێتەوە

ڕەفیق حیلمی لەم كتێبەدا (یادداشت، كوردستانی عێراق و شۆڕشەكانی شێخ مەحمود) حیكایەتی هاتنی عوسمانی و ئینگلیز بۆ كوردستان دەگێڕێتەوە و باسی شۆڕشی شێخ مەحمود دەكات، وەك شایەتحاڵێك ئەوەی بینیوێتی، دەیگێڕێتەوە و چیرۆكی ململانێی ئینگلیز و عوسمانی و ململانێی ئەتاتورك و عوسمانییەكان و یاخیبوونی ئەتاتورك لە بەرانبەر خەلیفە دەگێڕێتەوە. لەبارەی میساقی میللی تورك و فەرامۆشكردنی كوردەوە دەدوێت. باس لە دەوری شەریف پاشا دەكات لە موئتەمەری ئاشتیدا كە چۆن فریو دراوە.

## فیتنەییەكەی موصل

لە بەشێكی ئەم یادداشتدا نووسەر باسی سەردەمی جەنگی جیهانی دەكات كە چۆن سلێمانی ڕووبەڕووی برسێتی و نەخۆشی بووەتەوە، بە ئەندازەیەك، كە بەلەدییە توانای شاردنەوەی تەرمەكانی نەبووە. ئیتر برسێتی و نەخۆشی بوون بە هۆی تەشەنەسەندنی بەدڕەوشتی، سواڵكەر و لەشفرۆش پەیدا بوون. وێنەی سلێمانییەكی هیلاك و ماندوومان نیشان دەدا. سلێمانییەكی غەمگین. وێنەی ئەو ڕۆژگارە شوومە دەكێشێ، كە برسێتی چۆن تەنگ بە خەڵك هەڵدەچنێ.

لە بەشێكی ئەم بیرەوەرییانەدا نووسەر باس لە ڕووداوێكی گرنگ دەكات، ئەویش فیتنەی موصڵە، ئەو ڕووداوەی كە شێخ سەعید باوكی شێخ مەحمود و شێخ ئەحمەدی برای تیا دەچن و شێخ مەحمود دەرباز دەبێ. چیرۆكی فیتنەیی و نەوتبەئاگرداكردنی والیی موصڵ دەگێڕێتەوە، كە چۆن دەبێتە هۆی ئەوەی شێخ سەعید و شێخ ئەحمەد بكوژرێت. ئەوەش كە ئەم فیتنەیەی دروست كرد، بەها ئەفەندییە كە لە ڕۆژی ئاشووبەكەدا خۆی ون دەكات. دەوری شێخ مەحمود و چۆنێتیی دەربازبوونی لەو شەڕەدا دەگێڕێتەوە. ڕووداوی چوونی شێخ مەحمود بۆ كەركوك دەگێڕێتەوە، كە چۆن عەشایەر لە بەری بەیانییەوە بۆ پێشوازیلێكردنی ئامادە بوون و تووڕەبوونی عەشایەری كەركوك و هەولێر و سلێمانی لە ڕووداوی فیتنەی موصڵ و تیاچوونی شێخ سەعید و شێخ ئەحمەد.

ڕەفیق حیلمی لە چەند شوێنێكدا باس لەوە دەكات، كە شێخ مەحمود چەندین جار ڕووبەڕووی سزای سێدارە بووەتەوە. بەڵام توركەكان یاخود ئینگلیز ئەو كارەیان نەكردووە، بەو خەیاڵەی كە ڕۆژێك لە ڕۆژان سوودی لێوەرگرن. داگیركەران هەمیشە خەیاڵیان لای ئەوە بووە، كە چۆن مامەڵە بە كوردەوە بكەن. ئەوەتا لەم یادداشتەدا نووسەر دەڵێ: عەلی ئیحسان پاشا بە خەیاڵی سوود و قازانجی سیاسی شێخ مەحمود لە مەرگ ڕزگار دەكات.

## سلێمانی لە برسێتییەوە بۆ خۆشگوزەرانی

سەرلەبەری ئەم كتێبە باسوخواسی ململانێی كورد و تورك و ئینگلیزە. تەواوی كێشەكانیش وەك هەوری ڕەش بەسەر ئاسمانی ویلایەتی موصلدا گرمۆڵە بووبوون، ویلایەتی موصڵ، ئەو مەملەكەتەی بوو بە قوربانیی كێبڕكێی داگیركەران. ئینگلیز لە ڕێگەی نوئیل و ویلسن هەوڵیان دەدا سوود لە نفوزی شێخ وەربگرن بەو پێیەی كاریزمایەك بووە، لە ویلایەتی موصڵدا دەوری گرنگی بینیوە و بەشی هەرە زۆری عەشایەر و خوێندەوار گوێڕایەڵی شێخ بوون. ڕەفیق حیلمی شایەتحاڵی میوانداری ئینگلیز و كۆبوونەوەی عەشایر و پیاوانی ناودار و ئەهالی گەورە و نوێنەری ئینگلیز لە ماڵی شێخ مەحمود بووە. لێرەوە نووسەر ڕووداوی خۆشگوزەرانیی خەڵكی سلێمانی دەگێڕێتەوە لە دوای ئەو برسێتی و نەخۆشییەی كە شارەكەی هەراسان كردبوو. حیكایەتی پەیدابوونی ئینگلیز و تەخشانوپەخشانكردنی پارە بەسەر خەڵكدا و

گوزەرانی شار دەگێڕێتەوە. نووسەر چۆن باس لە برسێتییەکەی سلێمانی دەکات کە خەڵک لەبرسا دەمرێ، ئاوەهاش باسی سەردەمی بووژانەوە و تێربوونی خەڵک دەکات لە سلێمانی. ئینگلیز لەگەڵ عوسمانلیدا لەوەدا جیاواز بوو، کە ئینگلیز هەر شوێنێکی داگیر دەکرد، ڕێژەیەکی کەم خزمەتی ئەو شوێنەی دەکرد و بە کردنەوەی خوێندنگا و بیمارستان خەڵکەکەی دەخەڵتاند و سەرقاڵی دەکردن.

لە بەشێکی دیکەی ئەم بیرەوەرییانەدا نووسەر لەبارەی دەوری شێخ مەحمود و کۆنفراسی ئاشتییەوە دەدوێت. کە شێخ مەحمود مەزبەتەیەک ئامادە دەکات و شەریف پاشای کورد دەکرێ بە نوێنەری کورد لە کۆنفراسی ئاشتیدا تا داواکاریی میللەتی کورد بخاتە بەر باسوخواس و نووسەری ئەم یادداشتە ئەو مەزبەتەیە دەنووسێت، کە ڕەشید کابان و سەید ئەحمەد بەرزنجی بۆ گەیاندنی ئەم مەزبەتەیە بە دەستی شەریف پاشا ڕەوانەی پاریس دەکرێن. بە داخەوە ئەویش وەکو هەموو هەوڵەکانی دیکەی شۆڕشی کورد سەرناگرێ. کورد لە دێرزەمانەوە هەمیشە هەوڵی داوە مافی خۆی بە دەست بهێنێ و هەموو ڕێگەیەکی گرتووەتە بەر، بە مەزبەتە و بە پەیماننامە و بە شەڕ و ئاشتی و.. هەوڵی داوە و کەچی هیچ کات کورد نەخوێنراوەتەوە، بەڵێنەکان بەسەر کاغەزی فەرامۆشییەوە ئەرشیف کراون.

خەونی نوئیل دەوڵەتی کوردی بوو

لەم یادداشتەدا باس لە دەوری نوئیل کراوە، کە پێی وایە ئەگەر زەمان بە دڵی نوئیل بوایە، بناغەی دەوڵەتی کوردیی دادەمەزراند. ئەم پیاوە دڵسۆزی کورد بووە، بەڵام بە داخەوە ماوەی دەستبەکاربوونی لە ناوچەی کوردستان ئەوەندە نەبووە. بەریتانیاش بۆ هەر سەردەمە و نوێنەرێکی ناردووەتە کوردستان. کە هەریەکەیان بە جۆرێک مامەڵەیان کردووە. ڕەفیق حیلمی بە فەرمانی شێخ مەحمود کاری وەرگێڕانی بۆ نوئیل دەکرد و وانەی فێربوونی کوردیشی پێدەوتەوە و بەپێی گێڕانەوەی نووسەری ئەم یادداشتانە نوئیل کەسایەتییەک بووە، کە بۆ کورد دەوری باشی گێڕاوە، بە ڕاستی خەمی بۆ کورد خواردووە و هەر ئەو کاتە خەونی ئەوەی هەبووە کە گەشتێک بۆ کوردستانی تورکیا بکات، تا لە ڕەوشی کوردانی باکوور ئاگادار بێت.

هەوڵەکانی نوئیل سەری نەگرت و شێخ مەحمود متمانەی بە ئینگلیز نەبوو. تەقەلاکانی نوئیل بێسوود بوون و نێوان شێخ مەحمود و ویلسن ناکۆکی تێکەوت. لە بنەچەشدا نێوانی شێخ و ویلسن کۆک نەبووە. ئیتر ویلسن نوئیلی لەو کارە لابرد و مێجەر سۆنی کردە موستەشار لە جێگەی نوئێل. مێجەر سۆنیش دوژمنی شێخ مەحمود و حکومەتەکەی بوو، هەرچی نوئیلیش بوو، بە مەرامی خۆی گەیشت و بە ئەرکێک، بەریتانیا ڕەوانەی تورکیای کرد. نوئیل لەگەڵ فایەق تاپۆ (ئەحمەد فایەق بەگ) بەرەو تورکیا وەڕێ کەوتن. بەرنامەی نوئیل ئەوە بووە کە لە تورکیا بەد یداری پیاوانی شۆڕشگێڕی کورد بگات. لە ئەنجامدا لەویش نەگیرسایەوە و دوژمنان کەوتنە وێزەیان و وەدەریاننان.

نووسەر باسی سلێمانیی دوای نوئیل دەکات، کە بارودۆخەکە شێواوە و شار بەرەو ئاڵۆزی چووە، مێجەر سۆن ئەو پیاوە دڕندەیە بوو، کە سلێمانیی هەراسان کرد. ئیتر ئینگلیز سلێمانیی پڕ کرد لە عەجەم و هندی و عەرەب و ئەفغانی و جولەکە و ئەرمەنی.

ڕەفیق حیلمی

ڕەفیق حیلمی بە هۆی شارەزایی زمانزانینەوە توانیی بچێتە ناو باسوخواسی سیاسییەوە و لە شێخەوە نزیک بوو و بە هۆی زمانزانینەوە لە نوێنەرەکانی ئینگلیزەوە زۆر نزیک بووە، ئەم پیاوە زۆر سەرکەش و چاونەترسانە لەگەڵ ئینگلیزەکاندا مامەڵەی کردووە و هەرگیز حیسابێکی ئەوتۆی بۆ نەکردوون. ئەو وەک مامۆستایەک مامەڵەی لەگەڵ دەکردن، نەک وەک بەندەی ئەوان، بۆیە زۆر جار تووشی کێشە و ڕووبەڕووبوونەوە دەبوو، زۆریش بێزار بووە لەو دۆخە. وەک خۆی باسی دەکات، زۆر بێزار بووە لە ترۆفیزی کاپتن بیل. کە پیاوێکی توورە و لەخۆبایی بووە. نوئیل و بیل دوو کەسایەتیی زۆر جیاواز بوون، بیل کەسێکی لەخۆبایی و لوتبەرز بووە. ڕەفیق حیلمی لەگەڵ نوئیلدا زۆر ڕێک بووە و دۆستایەتییان هەبووە و بە پێچەوانەوە لەگەڵ بیلدا ناڕێک بووە و زوو زوو بەشەڕ هاتوون.

**سەرکەشیی عەشایەری کورد و فیزی بیل**

لە بەشێکی دیکەی ئەم یادداشتانەدا نووسەر لەبارەی سەفەرەکەی لەگەڵ بیلدا بۆ کۆیە دەدوێت. باس لە مامەڵەکردنی بیل لەگەڵ عەشایەرەکاندا دەکات، کە کێشەی زۆری لێکەوتەوە، فیز و لەخۆباییبوونی بیل و سەرکەشیی عەشایەر و سەرۆک خێڵەکان کێشەی زۆری دروست کرد. تورک و ئینگلیز شەڕی خۆیان بە عەشایەری کورد کرد.

نووسەر لە بەشێکی دیکەی کتێبەکەدا باس لە دیداری شێخ مەحمود و سمکۆی شکاک دەکات، کە چۆن شێخ ناردوویەتی بە دوایدا و بە نهێنی قسەی لەگەڵدا کردووە و گومانی لێکردووە، کە گوایە ڕەفیق حیلمی لەگەڵ مستەفا پاشادا کار بۆ ئەوە دەکەن لەگەڵ ئینگلیزدا ڕێک بکەون. دوای ئەوەی ڕەفیق حیلمی شێخ دڵنیا دەکاتەوە، کە شتی وا نییە. شێخ مەحمود ماچی دەکات و پێی دەڵێ گاڵتەم لەگەڵ کردی. لێرەدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، کە کورد لە دێرزەمانەوە ئەوەندەی خەریکی شەڕ و ململانێی ناوخۆیی بووە، ئەوەندە شەڕی دوژمنی نەکردووە. ئەوەتانێ نووسەر باسی شەڕی شێخ و ئاغا و عەشایەری دەستەی ئۆزدەمیر دەکات. ململانێی ڕەواندز و سلێمانی کە شەڕی تورک و ئینگلیز بووە و بە عەشایەری کورد کراوە، لەسەر خاکی کورد و کوردیش تێیدا بووە بە قوربانی. لە ئەنجامی دابەشبوونی عەشایەری کورد، شۆڕشی کورد لاواز بوو و ئینگلیزیش توانیی بە ئاسانی کۆنترۆڵی ناوچەکە بکات. ئیتر لە شەڕی دەربەندی بازیان شێخ مەحمود بە برینداری دەستگیر دەکرێ و دوای موحاکەمە دیسانەوە لە سزای مەرگ ڕزگاری دەبێ و نەفی دەکرێ بۆ هندستان. ئەمەش بۆ ئەوەی ئینگلیز جارێکی تر شێخ مەحمود وەک کارتی فشار بەکار بهێنێ لە

بەرانبەر بەرەی تورکیادا. خولاسە، چ ئینگلیز و چ تورک هیچ کات چاوی بەزەییان بۆ کورد نەبووە، بەڵکو چاوی بەرژەوەندی و ململانێی سیاسییان هەبووە.
بەشێکی ئەم یادداشتە گێڕانەوەی حیکایەتی شەڕی تورک و یۆنانە لە ساڵانی 1920کاندا. تورکیا وەک دەوڵەتێکی بەهێز لە شەڕێکی گەورەدا بوون لە لایەک لەگەڵ ئینگلیز و لە لایەک لەگەڵ یۆنان، ئینگلیز پاڵپشتیی یۆنانی دەکرد و فەڕەنسا و ئیتاڵیایش لەگەڵ تورکدا بوون و بە چەک و تەقەمەنی هاوکاریی تورکیایان دەکرد و پاڵەوانی ئەم شەڕە عیسمەت پاشا بوو. دیسانەوە کورد لە خشتە برا و تورک تا کاری بە کورد بوو، بە برای دینی و هاوئیمان و دۆستی خۆی زانیی تا کاتی سەرکەوتن و ئەوجا دیسانەوە کورد ئەرشیف کرایەوە.

## شێخ مەحمود کاریزمای سەردەمەکەی خۆی بوو

لە بەشێکی دیکەی ئەم یادداشتەدا نووسەر باس لە کەسایەتی شێخ مەحمود دەکات، کە چەند سەرنجڕاکێش بووە. هەر لە منداڵییەوە لە ناو خێڵات و پێکهاتەی سیاسیدا ناو و ناوبانگی هەبووە و کەسێکی دیار بووە. کە منداڵ بووە، لەگەڵ باوکی چووەتە ئەستەنبوڵ و سوڵتان عەبدولحەمیدی بینیوە. بۆیە شێخ مەحمود لەسەر ئاستی سیاسی و لەسەر ئاستی جەماوەریش لە ناو عەشایەردا دەوری هەبووە و بۆ ئەو سەردەمە کاریزمایەک بووە. وەک شەخسی خۆشی کەسێکی ئازا بووە.

ڕۆژی گەڕانەوەی لە هندستان و مەراسیمی بەخێرهاتنەوەی، یاخود ڕۆژی مردنەکەی ئەوە دەردەخەن کە شێخ چ کەسایەتییەکی کاریزمایی بووە. ڕەفیق حیلمی لەم یادداشتانەدا وێنەی ڕۆژی گەڕانەوەی شێخ لە مەنفا و وێنەی ڕۆژی مردنەکەی نیشان دەدا، وێنەی پێشوازیی خەڵکی نیشان دەدا. بە داخەوە ئینگلیز و تورک دەستیان بۆ یارییەک برد و شێخ مەحمودیش بوو بە کەرەستەی ئەو یارییە و لێرەوە شێخ مەحمود لە نێوان تورک و ئینگلیزدا تووشی گومان و ڕاڕایی بوو. ئەمە جگە لەوەی لەو یارییەدا دەوروبەرەکەی دەوری خراپیان گێڕا، هەر کەسە بە ویست و ئارەزووی خۆی کاری دەکرد. یەک بە لای تورکدا دای دەکێشا، یەک بە لای ئینگلیزدا، شەڕ و فیتنەیی ئۆزدەمیر و ئینگلیزیش لەو لاوە ئاژاوەی خستە نێوان شێخ مەحمود و عەشیرەتەکانی دیکەوە و ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە هەندێک لەو عەشیرەتانە لە فەرمانی شێخ مەحمود دەربچن. ئیتر لێرەوە کەسایەتیی شێخ مەحمود لە ڕووی جەماوەرییەوە تووشی قەیران بوو. باڵانسی کاریزماییبوونی دابەزی. بەزمی شێخ ئەمین سندوڵانیش کە قایمقامی ئەو کاتی ڕانیە بوو، نەهامەتییەکی دیکەی شێخ بوو. ئینگلیز شێخ ئەمینیان کردە وەسیلەیەک بۆ دژایەتیکردنی شێخ مەحمود. ئەمەش لە ڕێگەی بیلەوە کرا. ئیتر دابەشبوونی عەشیرەتەکان لە نێوان ئینگلیز و تورکدا وردەوردە شۆڕشی کوردی بەرەو فەنابوون برد.
ویستگەیەکی دیکەی یادداشتەکانی ڕەفیق حیلمی باسی ڕۆژنامەی پێشکەوتن و مێجەر سۆنە، کە مێجەر سۆن بڕیاری دەرکردنی ئەو ڕۆژنامەیەی داوە، تا نووسین لە بەرژەوەندیی ئینگلیز بڵاو بکرێتەوە. ڕەفیق حیلمی باس لەوەش دەکات، کە کەم کەس لەو ڕۆژنامەیەدا دەیاننووسی، عەیبە بووە لەو ڕۆژنامەیەدا بنووسی کە زمانحاڵی ئینگلیز بووە.

ڕەفیق حیلمی

وێستگەیەکی دیکەی ئەم کتێبە باسوخواسی دەوری تۆفیق وەهبی و ئەحمەدی عەزیز ئاغا و ماجید مستەفا و مەحمود جەودەت و خودی نووسەرە (ڕەفیق حیلمی)، کە چۆن لەگەڵ مێجەر سۆندا تووشی کێشە بوون، مێجەر سۆن چاوی لەسەریان بووە. لەپای ئەو چالاکییانەی کە کردوویانە، هەڕەشەی لێکردوون.

سلێمانی پڕ بوو لە تورکخوا

لە قۆناغی دوای ناردنی شێخ مەحمود بۆ هندستان، جڵەوی سیاسی لە دەست ئینگلیز دەرچوو، بۆیە ئینگلیز پەنا دەبەنە بەر سەید تەها شەمزینانی و ئەویش لە بەرانبەردا کۆمەڵێک داواکاریی هەبوو؛ لەوانە، دەوڵەتی کوردی. پاشان پەنا بۆ حەمدی بەگی بابان دەبەن و ئەویش سوودی نابێ. ئەوەی ئینگلیز دەیەوێت، بە حەمدی بەگ ناکرێ. حەمدی بەگ پیاوێکی خوێندەوار و ئەرستۆکرات بووە و لە ئەوروپا ژیاوە و لە ئەوروپاوە گەڕاوەتەوە، ئیتر چۆن دەتوانێ لە زمانی عەشایەر حاڵی ببێ. ئیتر هەوڵەکانی ئینگلیز شکست دەهێنن و دواجار ئینگلیز بە ناچاری شێخ مەحمودیان بۆ مەیدانی سیاسەت هێنایەوە. شێخیش دوای گەڕانەوەی داوای شارە کوردییەکانی دەکرد. شێخ بەوەشەوە نەوەستا، بەبێ پرسکردن بە ئینگلیز پلەی خۆی گۆڕی بۆ ڕەئیس و پاشان حوکمدار و پاشان مەلیکی کوردستان.

کەسایەتیی تایەرە ئەفەندیی مەسرەف، کە سەرکاتبی شێخ بوو، خزمەتی تورکی دەکرد و عەشایەریش لەگەڵ تورک بوون، ئیتر سلێمانی پڕ بوو لە تورکخوا. ئەمە مەترسیی لای ئینگلیزەکان دروست کرد. ئیتر لێرەوە وردەوردە کورد بەرەو لێژبوونەوە چوو. لەبارەی کوشتنی جەمال عیرفانەوە، نووسەر باسی ئەوە دەکا ئەو ڕۆژگارە ئۆزدەمیر لە سلێمانی خەریکی کوشتنی خەڵک بووە، لەو وەختەیا جەمال عیرفان کوژراوە، نووسەر باس لەوەش دەکا کە گوایە هەندێک دوژمنی خۆی کە مەرگەیین، کوشتوویانە.

**ڕەفیق حیلمی لە ڕۆژنامەی نەجمە**

قۆناغێکی دیکەی ژیانی ئەم پیاوە کارکردنی بوو لە ڕۆژنامەی نەجمە، کە بە هۆی نووسینەکانەوە لە دژی ئینگلیز و یۆنان تووشی گیروگرفت و ناڕەحەتی بووە. ئینگلیزەکان هەڕەشەیان لێکردووە و لە پۆست و پلەی کارکردن دەرکراوە.
ڕەفیق حیلمی دان بە هەڵەی خۆیدا دەنێ، کە بە هەڵە لە تورکیا تێگەیشتووە و ئەوە نەبووە کە ئەوان باوەڕیان پێی هەبوو. ئینگلیزەکانی دەبووغزاند و ڕق و کینەی بەسەر یۆنانییەکاندا هەڵڕشتووە، ڕەفیق حیلمییش وەک زۆربەی خەڵکی ئەو سەردەمە تورکخوا بووە. ئەو تورکیایەی کە بۆ کوردانی باکوور ئەوەندە باش نەبووە تا دڵسۆزیی خۆی بۆ کوردانی باشوور نیشان بدا. بەڵام کوردانی باشوور لەو ڕۆژگارەدا لەمە بێئاگا بوون.
وێستگەیەکی دیکەی ئەم کتێبە چیرۆکی دروستبوونی جەمعیەتی کوردستانە. نووسەر باس لە دروستبوون و هەڵبژاردنی هەیئەتی ئەم جەمعییەتە دەکات. کە ئەندامانی بریتیبوون لە ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ و فایەق بەگی مارف بەگ و شێخ عەلی سەرکار و شێخ محەمەد گولانی و صاڵح ئەفەندیی قەفتان و صدیق ئەفەندیی عەلەکە و نووسەری ئەم یادداشتە. لە هەڵبژاردنێکی نهێنیدا ئەمانە بوون بە هەیئەی سەرەکیی ئەم جەمعییەتە.

**بە تورەگەی بەتاڵەوە گەڕانەوە سلێمانی**

دوایین بەشی ئەم کتێبی تایبەتە بە گەشتەکەی ڕەفیق حیلمی و هاوڕێکانی، کە فەتاح ئەفەندی یوزباشی و ئەحمەد تەقی بوون. نووسەر باسی ئەو گەشتەی خۆی دەکات بۆ تورکیا و بۆ دیداری دەسەڵاتدارانی تورک و بیروڕاوەرگرتنی ئەوان لەسەر مەسەلەی کورد لە کوردستانی عێراق.

نووسەر باسی ئەوە دەکات کە چۆن و بە چ دەردێک دەگەنە ئەنقەرە، لای ئۆزدەمیرەوە بۆ ورمێ و شەرفخانە و شیستەر و تەبرێز و پاشان بۆ ئەستەنبوڵ و جولفا و تفلیس و باتوم و... دوو مانگ بەڕێوە دەبن تا دەگەنە ئەنقەرە و لەوێش وەک نووسەر دەڵێ، مایەپووچ دەرچوون و دەسەڵاتی ئەو کاتەی تورکیا هیچی بۆ کورد پێنەبوو و بە تورەگەی بەتاڵەوە گەڕانەوە بۆ سلێمانی. نووسەر بە دووورودرێژی باسی گەڕانەوەکەشیان دەکات. لە عەنتابەوە بۆ ئۆرفە و لەوێشەوە بۆ دیاربەکر و بتلیس و ئەخلات، تا وەک شاندێکی نائومێد گەیشتنەوە سلێمانی. کۆی ئەم باسوخواسانە کە بەسەرهاتی کەسایەتییەکی سیاسیی کاریگەر بووە لە دەوڵەتی شێخدا، ژیانی سیاسی و چیرۆکی سیاسەت و داگیرکاری و شۆڕش و کۆمەڵگەی کوردەواریی ئەو کاتەمان بۆ دەگێڕێتەوە. نووسەری ئەم یادداشتە لە گێڕانەوەی ڕووداوە سیاسییەکاندا وێنە و نەخشی ڕۆژگارێک نیشان دەدا، کە کورد تێیدا لە نێوان ئیمپراتۆریەتە گەورەکاندا چەوسێنراوەتەوە.

**ڕەچەڵەکی ڕەفیق حیلمی**

ڕەفیق حیلمی بە ڕەچەڵەک ئەگەڕێتەوە سەر بنەماڵەی (هەمزاغای مەسرەف)، کە یەکێکە لە پاڵەوانە ئەفسانەییەکانی دوانزە سوارەی مەریوان. یەکەم کەسە کە بە بەڕێوەبەری گشتیی (پەروەردە)ی کوردستان دەستنیشان کراوە. ماوەی دوو ساڵ لە پۆستی سەرۆکی شارەوانیی بەغدا خزمەتی کردووە. لە سەردەمی (عەبدولکەریم قاسم)دا بووە بە ڕاوێژکاری ڕۆشنبیری لە باڵیۆزخانەی عێراق لە تورکیا، بەڵام دواتر لەسەر بیروباوەڕی کوردایەتی لە کارەکەی لابرا. ڕەفیق حیلمی ڕۆڵێکی گەورەی بینیوە لە داڕشتنی دەستووری کاتیی عێراق لە سەردەمی عەبدولکەریم قاسمدا. لە سەردەمی شێخ مەحمودی حەفیدیشدا یەکێک بووە لە ڕووناکبیرە باوەڕپێکراوەکانی شێخ و گەلێ ئەرکی شۆڕشگێڕانەی لە حکومەتەکەی

ڕەفیق حیلمی

شێخدا لە ئەستۆ گرتووە.
ڕەفیق حیلمی ساڵی 1898 لە شاری کەرکووک لەدایک بووە، خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی لە کەرکووک و سلێمانی تەواو کردووە و ئامادەیی لە بەغدا و پەیمانگای ئەندازەی لە ئەستەنبوڵ تەواو کردووە. لە ساڵی 1920دا گەڕاوەتەوە کوردستان و بووە بە مامۆستای پسپۆڕی ئەندازە و بیرکاری. لە ماوەی خوێندنی لە ئەستەنبوڵ فێری زمانی تورکی و فەڕەنسی بووە. کە شێخ مەحموودی حەفید بۆ جاری دووەم لە مانگی تشرینی یەکەمی 1922 کابینەیەکی تازەی دانا و ناوی خۆی نا مەلیکی کوردستان، ڕەفیق حیلمیی کردە ڕاوێژکاری ڕامیاریی خۆی. ئەم ناودارە گەلێک وتاری ڕامیاری لە ڕۆژنامەی (ڕۆژی کوردستان) زمانحاڵی میریی مەلیک مەحمود نووسی. کاتێک بە پیلانی بەریتانیا و بە زەبری هێزی چەکداری لەناو برا، ڕەفیق حیلمی دوور خرایەوە و کرا بە مامۆستای بیرکاری، بەڵام دەستی لە کوردایەتی بەرنەدا و زیاتر لەسەر گەیشتنی کورد بە مافی چارەنووسی خۆی هەوڵی دا. یەکێک بووە لە ڕێکخەرانی شەڕەکەی بەردەرکی سەرای سلێمانی لە ساڵی 1930 و ماوەیەک لەسەر ئەمە گیرا.
کاتێ ناوی پاڵێوراوان بۆ سەرکردایەتیی حیزبی هیوا دەستنیشان دەکرێ، ڕەفیق حیلمی کە ئەو کات بەڕێوەبەری قوتابخانەیەک بوو لە کەرکووک، توانیی سەرکەوتن بە دەست بهێنێ و بە زۆرینەی دەنگ بوو بە سەرۆکی حیزبی هیوا. پاڵێوراوەکان بریتی بوون لە ئەمین زەکی بەگ کە لەو کاتەدا وەزیری ئابووری بوو، تۆفیق وەهبی، جەمال بابان، مەعروف چیاوگ. بەرلەوەش ڕەفیق حیلمی ئەو کاتەی لە سمود خوێندکار بووە، کۆمەڵەیەکیان دامەزراند بە ناوی (هێڤی) و بۆ زیندووکردنەوەی ناوی ئەو کۆمەڵەیە ناوی ئەم حیزبە نرا (هیوا).
حزبی هیوا تا کۆتایی ساڵی 1943 و نیوەی یەکەمی 1944 بەهێزترین کۆمەڵەی ڕامیاریی کورد بوو. یارمەتییەکی باشی شۆڕشی ڕزگاریخوازی بارزانی دا، لە جێی حیزبی هیوا دوو ڕێکخراوی ڕامیاری کورد دروست بوون و پەرەیان سەند، ئەوانیش پارتی شۆڕش و پارتی ڕزگاری بوون و لە 1946-8-16یش لە شوێنی هەردوو ڕێکخراوە ڕامیارییەکە (پارتی دیموکراتی کوردستان) دروست بوو، ڕەفیق حیلمییش وەک ناودارێکی ڕامیاریی گەورەی کورد مایەوە تاکو لە 1960-8-4 کۆچی دوایی کرد.

**ڕەفیق حیلمی شاعیر و مێژوونووس بووە**

وەرگێڕ و ڕەخنەگرێکی باش بوو، لە ماوەی ژیاندا کۆمەڵێک بەرهەمی بە چاپ گەیاندووە. چاپکراوەکانی "کورد لە بەرەبەیانی مێژووەوە تا 1920 بە زمانی عەرەبی/ خولاسەی مەسەلەی کورد (لە فەڕەنسیەوە) کردوویەتی بە کوردی/ شیعر و ئەدەبیاتی کوردی - بەرگی یەکەم، لە 1941 و بەرگی دووەمیشی لە 1956دا بە چاپ گەیاند/ یادداشت (کوردستانی عێراق و شۆڕشەکانی شێخ مەحموود/ دیوانێکی شیعری بە ناوی پاش تەمووز و کاری ڕۆژنامەگەریشی کردووە و ماوەیەک لێپرسراوی بەشە تورکییەکەی ڕۆژنامەی (بانگی کوردستان) بووە و ماوەیەکیش لێپرسراوی ڕۆژنامەی (ئومێدی ئیستقلال) بووە.

# لە کتێبی (یادداشت)ەوە

**ئا: ڕۆڤار**

پاکیزەی کچی ڕەفیق حیلمی، لە پێشەکیی کتێبی یادداشتدا باس لەوە دەکات کە ئەم کتێبەی مامۆستا ڕەفیق بیرەوەریی نزیکەی پەنجا ساڵ ژیانی پڕ لە ئەندێشە و ئازاری باوکیەتی، کە وێنەیەکی ڕاست و بێئارایشتی ژیانی کوردیشە لە پێش شەڕی یەکەمی جیهانەوە تا دواڕۆژەکانی ژیانی مامۆستا خۆی، کە لە ساڵی 1960دا کۆتایی هات، پاکیزە خان لەو پێشەکییەدا نووسیویەتی: خولیای نووسینەوەی مێژووی خەباتی نەتەوەیی کورد لە مێشکی ڕۆڵەی دڵسۆز و جگەرسوتاوی کورددا، ڕەفیق حیلمی، خولیایەکی بێهاوتا بوو و ئارامی لێ هەڵگرتبوو شەووڕۆژ پێوەی خەریک بوو.

دوای گەڕانەوەی «شێخ مەحمود» بۆ سلێمانی:

دوای ئەمە کە شێخان گەڕانەوە سلێمانی، بە ماوەیەکی کەم لە (کفری) باوکی (بەها فەندی) کوژرا. ڕاسپێری ئەم کوشتنە ئەدرێتە پاڵ «شێخ مەحمود». لەسەر ئەو لە پاش ملە حوکمی (٣) ساڵ زیندانی ئەدرێت بەسەرا. بەڵام «شێخ مەحمود» خۆی نادا بە دەسەوە و هەر لە دەوروپشتی سلێمانی و لە دێهاتەکانی خۆیا ئەمێنێتەوە. حکومەتیش بە ڕاستی شوێنی ناکەوێت و بەم خۆ دەرخستنەی و نەهاتنی بۆ ناو شار چاوی لێ ئەپۆشێ و لێی ئەگەڕێت. لەگەڵ ئەمەشدا نفوزی «شێخ مەحمود» ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو زیادی و ئەستێرەی بەختی سەر لە نوێ ڕوو لە سەرکەوتن و (برووز) دا بوو.

لەبەر ئەمە حکومەت وردە وردە شکی لێ پەیا ئەکرد و ترسی ئەوەی لێ هەبوو کە بە هۆی عەشایرەوە (کەین و بەین)ێک ڕێک بخاو تۆڵەی کارەساتی موصڵ بسێنێتەوە....

شەڕی گەورەی گشتی یەکەم و شێخ مەحمود

وەکو ئەیزانین شەڕی گشتی یەکەم لەڕووی وەلیعەهدی (ئەوستریا و مەجارستان= نەمسە) وە هەڵگیرسا. ئەم وەلیعەهدە کە خۆی و ژنەکەی بۆ زیارەت چووبوونە (صربستان- یوغوسلافیا) لەوێ لەلایەن ئەوانەوە کوژرا کە دوژمنی ئەوستریا و مجارستان بوون وە بەربەرەکانی سیاسەتی ئەو دەوڵەتەیان ئەکرد لە (صربستان)دا.

ئینجا کەوتە شەڕەوە (١٩١٤) وە ئەم شەڕە وردە وردە پەرەیسەند و نزیکەی هەموو دنیای گرتەوە. کە حکومەتی عوسمانی تێکەڵ بەم شەڕەبوو، شەڕ کەوتە عێڕاقیشەوە کە بەشێک بوو لە وڵاتی عوسمانی.

ئینگلیزەکان لە (بەصرە) و دەسیان پێ کرد و یەک لە دوای یەک (عمارە)، (کوت) و (بەغدا= بغداد) یان گرت و لە ساڵی ١٩١٨ دا گەیشتنە (کرکوک). بەڵام پێش ئەوە کە بگەنە سنووری لوای (کوت)، سوارەی عەشایری کورد و عەرەب لە (شعیبە)دا یەک دوو شەڕیان لەگەڵ ئینگلیزەکان کردبوو. «شێخ مەحمود» لەم شەڕانەدا بە خۆی و لەشکرێکی هەزار سواری کوردەوە یارمەتی لەشکرێکی تورکی دابوو. «ڕەشید پاشا»ی خەلقی سلێمانی کۆنە (متصرف)ی (منتفک) و چەن پیاوێکی ناودارتری کورد لە شەڕی (شیعە)دا کوژرابوون. چە لەم شەڕانەدا و چە لە شەڕی هێزەکانی تورک لەگەڵ ڕووسەکان لە دەوری (پێنجوێن)دا شێخ مەحمود ئازایی خۆی نواندبوو و ڕووسەکانی لە سنووری عێڕاق دوورخستبووەوە و کردبوونی بە دیوی (ئێران)دا. بەم چەشنە لە دوا ڕۆژەکانی شەڕی گێتی یەکەمدا ناوبانگی «شێخ مەحمود» زۆر ڕۆیشتبوو و گەلێ کەس ناسیبووی. بەڵام لە شەڕی تورک و ڕووسدا تورکەکان جارێکی تر شێخ مەحمودیان (زیز) کرد. سەرکردەی لەشکری تورک دوای ئەمە کە لە شەڕەکەدا بە یارمەتی «شێخ مەحمود» و هێزە عەشایرەکەی کورد سەرکەوتبوو و ڕووسەکانی شکاندبوو و تا ناو خاکی ئێران بەرەو دوای نابوون، بە بیانووی تاڵانەوە کوردەکانی گونابار کرد و چەن (سەرکۆمار)ێکی نا بە (شەست تیر)ەوە. شێخ مەحمود لەسەر ئەمە چوو بەگژ سەرکردەی لەشکری تورکەکاندا و بە خۆی و هێزەکانی کوردەوە گەڕایەوە سنووری سلێمانی. دوای ئەمە تورکەکانیش دووبارە تووشی هەڵمەتی ڕووسەکان هاتن و خۆیان پێ نەگیرا. ئیتر هەر ئەمەبوو سنووری عێڕاق لەم لایەوە بەبێ پاراستن مایەوە. کە «شێخ مەحمود» گەڕایەوە سنوور، نەهاتەوە سلێمانی. لە دێهاتەکانی خۆیدا و لە دەرەوەی شار مایەوە. ئەمە تورکەکانی خستبووە ئەندێشەوە. بەڵام لەو ڕۆژەدا زۆر بێ هێز کەوتبوون و نەیان ئەویست دەرگای سەر ئێشەیەکی تریش بۆ خۆیان بکەنەوە. لەولای تریشەوە لە (٧ی نیسانی ٩١٨) لەژێر سەرەکی (ژەنەراڵ مارشاڵ)دا هێزێکی

ئینگلیز گەیشتە کرکوک. شێخ مەحمود لەگەڵ تورکەکان بە تەواوی تێکچووبوو و هیواری هیچی پێیان نەمابوو. لەبەرئەوە ویستی کە پێش گەیشتنی ئینگلیزەکان لە سلێمانی لە کات و لە هەل کەڵک وەربگرێ و دوای ئەوە کە لەگەڵ پیاوە ناسراوەکانی ئەو دەمەی (سلێمانی) دا پێک هات، نامەیەکی بەدزییەوە ناردە کرکوک بۆ (ویلسن) و ژەنەراڵ مارشاڵ کە (کرکوکی) ی گرت.

گەورەی هێزەکانی ئینگلیز. لەم نامەیەدا داوای ئەوەی لێ ئەکردن کە بڕیار بدەن بە دامەزراندنی حکومەتێکی کورد لە ناوچەی سلێمانی لەگەڵ هەندێ قەول و بڕری ترو (إمتیازات). خۆشی (واتە شێخ مەحمود) بڕیاری ئەوەی ئەدا کە بە ناوی ئینگلیزەکانەوە و لەژێر چاودێری ئەواندا سەرەکی ئەم حکومەتە بکا.

(ویلسون) وەڵامی شێخ محمود ئەداتەوە و خەریک ئەبێ کە لەم لایەنەوە (بەیان) ێک بڵاوبکاتەوە[1]. لەم حەلەدا و دوای بەجێ هێشتنی کرکوک بە چەن ڕۆژێک لەشکری تورک گەڕایەوە کرکوک. باسی نامەکەی «شێخ مەحمود» کە بە هۆی یەکێک لە گەورەکانی خەڵقی کرکوکەوە نێررابوو، ئەگا بەسەر لەشکری تورکەکان. لەسەر ئەمە ڕاسپێری ئەدا بە «مستەفا بەگی» قائمقامی عەسکەری و سەرکردەی لەشکری تورک لە سلێمانی. مستەفا بەگ بە فێڵ و بە بیانووی هەندێ باس و تەگبیرەوە «شێخ مەحمود»ی داوا کردە لای خۆی و دەس بەجێ گرتی ولەژێر چاودێری هێزێکی گەورەدا ناردیە (کرکوک). شێخ مەحمود لەوێ خرایە بەندینخانەوە و لە دوای محاکمەیەکی عەسکەری سەر زاری و لەسەر ڕاسپێری تایبەتی سەر لەشکری گشتی هەموو هێزەکانی دەوڵەتی عوسمانی لە عێراق، بە خنکاندن مەحکوم کرا. بەڵام ئەمجارەش لە مردن ڕزگاری بوو. چونکە تورکەکان لە پێش هەموو شتێکا لە خنکاندنی شێخ مەحموددا دوو دڵ بوون. بیریان لەدوا ڕۆژ واتە لە ڕۆژی ڕەش و تەنگانە ئەکردەوە. هەر چەن کشانەوەی ئینگلیزیان لە کەرکوک ئەدایە پاڵ شکستی لەشکرەکانی سوێندخۆرەکان لە جەبهەی (فرانسە) و بە تەمای ئەوە بوون کە لەشکرەکانی ئینگلیز وردە وردە نەک هەر لە کرکوک، بەڵکو لە هەموو عێراق بکشێتەوە، دیسانەوە نەیان ئەویست کە زۆر شوێن خەیاڵ بکەون و هەموو پێشهاتێک بنێن بەلاوە. لەوە ئەترسان کە چەرخ بە بارێکی ترا وەرگەڕێ و خۆیان (واتە تورکەکان) جارێکی تریش بێ ئەوەی گەڕانەوەی لە دوا بێ

1 1 Loyalties Mesopotamia Volume 11. 1919-1920 A Personal Historical Record, By Sir Arnold T. Wilson, M. P.

الجزء الأول

مذكرات

وضعها باللغة الكردية

رفيق حلمي

ترجمها الى اللغة العربية

الاستاذ جميل بندى الروژبيانى

فصول من ثورات الزعيم الكردى
المعروف الشيخ محمود ونبذ من
القضية الكردية ...

بغداد : ١٩٥٧ مطبعة المعارف

بکشێتنەوە و لە عێراق بچنە دەرەوە. ئینجا لە ڕۆژێکی وا ڕەشادوور نەبوو کە بە بیانووی تۆڵە سەندنەوەی خنکاندنی «شێخ مەحمود» عەشایری کورد شوێن لەشکری شکستەی تورک بکەوێت و شپرزەیان بکەن. لەگەڵ ئەمەشدا لە تورکەکان بەدوور نەبوو کە دوای هەندێ منجەمنج و هێنان و بردن، لە ناکاوا «شێخ مەحمود» بخنکێنن. بەڵام بەخت یارمەتی داو (عەلی ئیحسان پاشا) کە تازە هاتبووە جێی (خەلیل پاشا) و بووبوو بە سەر لەشکری (ئۆردووی شەشەم) لە عێراق، کەوتە سەر بیری ئەوە کە لە ڕۆژێکی وادا لە «شێخ مەحمود» إستفادە بکا. چونکە ئەم عەلی ئیحسان پاشایە کە یەکێک بوو لە سەر لەشکرە گەورە و هەرە ناودارەکانی تورک و لە (ئێران) دا بەرامبەر بە (ڕووس)ەکام چەن شەڕێکی گەلێ ئازانەی کردبوو، لە دەوری بێ هێزی و شکستی لەشکرەکانی تورکدا نێررایە عێراق. لەسەری پێویست بوو بە هۆش و بە سیاسەت بجوڵێتەوە لەبەرئەمە لە (موصڵ)ەوە شێخ مەحمودی داوا کردە لای خۆی.

لەوێ زۆر دڵنەوایی کرد و ئاشتی کردەوە. مەبەستی ئەوەبوو کە لەو ڕۆژەدا تا خۆی بە لەشکرەوە بەرامبەر بە ئینگلیزەکان خەریک ئەبێ «شێخ مەحمود» لە هەرێمی سلێمانی دا بە عەشایری کوردەوە تەنیشتی چرپی (خۆرهەڵات) هێزەکانی تورک بپارێزێت و (سلێمانی) نەدا بە دەستەوە تاوەکو لە کاتی پێویستیشا بتوانێت بە خۆی و عەشایری کوردەوە یارمەتی لەشکرەکانی تورک بدا. لەبەرئەمە دوای میوانداریییەکی باش و نوازشێکی زۆر و خەڵات و بەرات، کردی بە (قائدی ملیس= سەرلەشکری مەدەنی) و بە ڕاسپێری و تەعلیماتێکەوە کە پێویست بێ ناردییەوە سلێمانی. بۆ ئەم کارە و ڕێکخستنی هێزی عەشایر، پێشەکی (٥٠٠٠) لیرەیەک ئاڵتوونی عوسمانی دایێ[2] جگە لەمە «عەلی ئیحسان» ئەمری دا بەسەر لەشکری تورک لە سلێمانی کە هەر چەک و سلاحێک کە بتوانێت بە «شێخ مەحمود» پێویست بێ بیداتێ.

ئینجا دووای ئەمانە هەمووی، و لەسەر ئەم قەول و برە لەگەڵ «عەلی ئیحسان پاشا»، شێخ مەحمود لە تشرینی دووەمی (١٩١٨)دا گەڕایەوە سلێمانی و دەمی کرد بە ڕێکخستنی ئەو کارانەی کە پێی سپێردرابوو....

هاتنەوەی ئینگلیزەکان بۆ کەرکوک

جاری یەکەم کە ئینگلیزەکان هاتبوونە کەرکوک و گرتبویان شێخ مەحمود ئەوەی بە بیرا نەهاتبوو کە جارێکی تر تورکەکان بگەڕێنەوە کەرکوک بیگرنەوە. لەبەرئەوە وەکو لەسەرەوە وتبوومان نامەیەکی ناردبوو بۆ (ویلسن). لەم نامەیەدا جگە لەوانەی کە باسمان کردبوو ئەی وت: کوردەکان سەرکەوتنی ئینگلیزیان زۆر پێ خۆشە و هیوایان وایە کە لە حوکمی تورک ڕزگاریان ببێ و لەژێر باڵی حکومەتی ئینگلیزا بحەسێنەوە وە بە سانی

2 تأریخ الوزارات العراقیة. مامۆستا (عبدالرزاق حسنی).

عەرەبەکان بکەونە خۆشی. و تکای ئەوەی لێ ئەکردن کە ئیتر بە هیچ کلۆجێ ڕێی ئەوە نەدەن کە تورکەکان بگەڕێنەوە ئەم وڵاتە. هەر لەو ڕۆژانەدا ڕەئیسەکانی (هەمەوەند)یش نامەیان بۆ ئینگلیزەکان نووسیبوو و ئەیان وت کە ئامادەن بۆ یارمەتی لەشکری ئینگلیز لەڕێی پێشکەشکردنی حەیوانات و دەغڵەوە. چونکە لەو حەلەدا بە ڕاستی گۆشت و نان باشترین دیارییەک بوو کە ئاتاجی بن. بەڵام گەڕانەوەی تورکەکان بۆ کەرکوک بوو بە هۆی تێکچوونی هەموو شتێک. «شێخ مەحمود» وەکو گێرامانەوە لە سلێمانی گیرا و نێررایە کەرکوک. گەلێ لەوانەی کە لە ناردنی نامەکەی پێشوودا هاوبیری بوون خرانە بەندیخانەوە و یا جەریمەکران.

هەندێکیشیان ڕایان کرد و سلێمانیان بەجێ هێشت. هەمەوەندەکانیش لەو ڕۆژەوە لە ئینگلیزەکان هەڵگەڕانەوە و بوون بە دوژمنیان. بەم چەشنە دوای گرتنی کەرکوک بە چەن ڕۆژێک گەڕانەوەی ئینگلیزەکان و کشانەوەی لەشکرەکانیان لەوێ، بوو بە هۆی گەلێک خراپە بۆ خەڵقی ئەو ناوە. وبەتایبەتی «شێخ مەحمود» و کوردەکان بەمە کەوتبوونە داوێکی گەورەوە.

ئینگلیزەکان خۆشیان ئەو ناوو شۆرەتەی هەیان بوو بەم کشانەوەیە دایان ناو بە چەشنی هەمەوەندەکان گەلێ کەسی تریشیان لێ هەڵگەڕایەوە. دەنگیش وابوو کە لە جەبهەکانی تری شەڕاو بەتایبەتی لە فرەنسە لەشکرەکانی سوێندخۆرەکان بەرامبەر بە ئەڵمانەکان خراپ شکاون و کشاونەتەوە. لەبەرئەمە وا

ئەهات بە بیرا کە لەشکری ئینگلیزیش لە عێراق بکشێتەوە و بچێتە جەبهەکانی تر. ئینگلیزەکان بۆیان دەرکەوت کە بەم کشانەوەیە ناویان زرراو لە کوردستان و عێراقدا نرخێکیان نەما. لەوەش کەوتنە ترسەوە کە لە هەموو لایەکەوە لێ یان ڕاست بنەوە و شۆڕش و ئاژاوەیەکی گەورەی گشتی بخەنە ناوەوە. لەبەرئەمە بڕیاریان دا کە خۆیان کۆبکەنەوە و بۆ کڕینەوەی ناو و ئیعتیباریان و بە هەر جۆرێک بێ کەرکوک بگرنەوە. ئینجا لەم ڕۆژانەدا بوو کە سوێندخۆرەکان (موتارەکە) یان بڵاوکردەوە و شەڕ وەستا. بەڵام هێزەکانی لە کاتێکا کە لە جەبهەکانی ترا شەڕ وەستا و ترسیان نەمابوو، لە جەبهەی عێراقدا ویستیان لە کات کەڵک وەربگرن و لە هەنگامەی مزاکراتی ئاشتیدا لەشکرەکانیان لە جەبهەکانی شەڕا بەتایبەتی لە (ولایەتی موصڵ)دا هەنگاوێک زیاتر لە پێشەوە بێ.

لەبەرئەمە هەڵیان کوتایە سەر (کرکوک) و (هەولێر) و بێ شەڕ گرتنیان. لە دوای ئەمە دەس بەجێ

دەستیان کرد بە کۆکردنەوەی ئەو (دەغڵ) و (دان) و (مەڕ) و (ماڵات)ە کە لەشکرەکانی تورک کۆیان کردبووەوە و نەگەیشتبوونە سەر خوانی. «عەلی ئیحسان پاشا» کە بڵاوکرانەوەی کتوپڕ (موتارەکە) ی نەهاتبوو بە بیرا، فەوجە عەسکەرەکەی (سلێمانی) لەوێ هێشتبوو و نەی کێشابووەوە موصڵ. بەمە ئەو فەوجەی لە لەشکرەکەی خۆی پچڕاندبوو و دووری خستبووەوە. چونکە بە تەمای ئەوەنەبوو کە بەو زووانە ئینگلیزەکان بگەڕێتەوە کەرکوک و بیگرنەوە. لە سەرێکی تریشەوە بە هیوای «شێخ مەحمود» بوو کە لەلای خۆرهەڵات واتە لەلای سلێمانییەوە و بە هێزی عەشایر هەڕەشە لە هێزەکانی ئینگلیز بکا و ماوەیان نەدا بێنە پێشەوە.

ئەگەر ئەمەیش نەکا و یا پێی نەکرێت ئەوەندەی لێ ڕائەپەرموو کە ئەم تەنیشتەیان لێ بگرێت و سلێمانی لە گرتن بپارێزێت. و بەم جۆرە ئەیویست کە تا ئەنجامی گرتن و جێ هێشتنی یەک لە دوای یەکی کەرکوک لەلایەن هێزەکانی تورک و ئینگلیزەوە دوایی دێت و وەزع لەسەر قەرارێک ئەوەستێت و بە لایەکدا ساغ ئەبێتەوە، هەرێمی سلێمانی بە دەس تورکەوە بێت و دەست ئینگلیزەکان نەکەوێت. هەر لەم ڕۆژانەدا بوو کە بە هیوای تازەکردنەوەی دۆستایەتی لەگەڵ «شێخ مەحمود» عنوانی (نقیب)ی بۆ وەرگیراو بوو بە «شێخ مەحمودی نەقیب».

بەڵام وەکو لەمەوبەر وتمان لەناکاو و لە (٣١) ی تشرینی یەکەمی (١٩١٨)دا (موتارەکە- هدنە) بڵاوکرایەوە. ئیتر «عەلی ئیحسان پاشا» چاری نەما و بە «تەلگراف» ئەمری دا بە متصرفی سلێمانی کە ئیدارەی لواکە بداتە دەس «شێخ مەحمود» و خۆی بگەیەنێتە موصڵ.

«شێخ مەحمود» بەم جۆرە بوو بە متصرفی سلێمانی و جارێ بە ناوی حکومەتی عوسمانییەوە ئیدارەی گرتە دەس. متصرفی تورکەکان لەو

ڕۆژەدا لە سلێمانی «عەلی ڕەزا بەگ» ناوێکی خەلقی (قۆنیە) بوو.

لەگەڵ ئەو پیاوانەی میری کە تورک و یا غەیرە کورد بوون سلێمانیيان بە جێ هێشت و چوونە موصڵ. فەوجە عەسکەرەکەی تورک و لەژێر سەرەکی صالح بەگی (گابور أغامی) دا هەندێ جەندەرمە هێشتا لە سلێمانی بوون. بەڵام کە حاڵ گەیشتە ئەم ڕادەیە «شێخ مەحمود» جارێکی تر دەسی لە ڕێکخستنی ئەو هێزە (هێزی میلیس) هەڵگرت و کەوتەوە سەر سەوداکەی پێشووی. ئەمجارەش بیری لەوە کردەوە کە بەرامبەر بە هەندێ قەول و برر و إمتیازات، سلێمانی تەسلیم بە ئینگلیزەکان بکا. بەڵام نامەی ئەمجارەی بە عززەت طوبچی (عزەتی فاتە) و بە (ئەحمەد فائق= فایقی طاپۆ) دا راستە و ڕاست ناردە کفری.

بەرامبەر بەو إمتیازاتە کە بۆ خۆی و بۆ کورد بە شەرتی دانابوو ئینگلیزەکانی داوا کردە سلێمانی. ئینگلیزەکان کە لە تەرتیباتی «عەلی ئیحسان پاشا» لەگەڵ شێخ مەحمود ئاگاداربوون ئەمەیان لێ ڕانەپەڕموو بە تەما نەبوون کە تاکاتی خۆی نەبێت بێنە سلێمانییەوە.

لەبەرئەوە ئەم نامەیەی «شێخ مەحمود» یان پێ خۆشبوو و ناردیان بۆ (ویلسن). خۆیشیان وەڵامی (بەڵێن)یان بۆ ناردەوە و داوایان لێ کرد کە چاوەڕوانی ئەمری «ویلسن»ی حاکمی عام بکا...

هاتنی (میجەرنوئیل) بۆ سلێمانی:

نامەی ئەمجارەی «شێخ مەحمود» لەلایەن ئینگلیزەکانی (کفری)یەوە نێررا بۆ (ویلسن)ی حاکمی عام عێراق.

لەبەرئەمە ناردی بە شوێن (میجەرنوئیل) دا کە یەکێک بوو لە زابتە ئینگلیزەکانی شارەزا بە هەرێمی کوردستان. بە ڕاسپێری تایبەتی و بە ناوی خۆیەوە ناردی بۆ (سلێمانی) نوئیل لەگەڵ هەیئەتێکی بچووک[3] و بە میجەرنوئێل (موستەشاری) شێخ مەحمود ڕێی چیاکانی بەینی و یەکەم نوێنەری ئینگلیز لە کوردستان (کفری) و چەمچەماڵ داهاتە (داریکەلی)[4] کاتێ باسی هاتنی «نوئێل» بۆ (داریکەلی) لە سلێمانی بڵاوبوەوە، ئەو فەوجە عەسکەرەی تورک کە لە سلێمانی مابووەوە هەر کوردێکی تیابوو فەوجەکەیان بەجێ هێشت و بەرگی کوردیان لەبەر کرد. ئەوانەی کە ئەشترسان خۆیان شاردەوە. تورکەکان و ئەوانەی غەیرە کوردبوون شڵەژابوون و نەیان ئەزانی چی بکەن.

«شێخ مەحمود» لە پیاو ماقووڵە ناسراوەکانی هەموو جوورەی ئەو دەورەی سلێمانی مەجلیسێکی لە ماڵی خۆیا گرت و تێی گەیاندن کە هەیئەتێکی ئینگلیز بەڕێوەن و دێنە سلێمانی. لێی داواکردن کە لەناو خۆیاندا چەن کەسێک هەڵبژێرن کە بچن بە پیریانەوە. دوای مشتومڕ و مقۆمقۆیەکی کەم هەیئەت ڕێکخراو بە سواری وڵاخ چون بە پیر ئینگلیزەکانەوە. ئینگلیزەکان لە پێشەوە نەیانویست بێنە ناو سلێمانی. لە مانەوەی فەوجەکەی تورک لە سلێمانی مەترسییان هەبوو.

چونکە ئەوان هێزێکیان لەگەڵ خۆیاندا نەهانی بوو. بە تەمابوون شێخ مەحمود لە (داریکەلی) بیان بینێ. بەڵام «شێخ مەحمود» کە هەیئەتەکەی نارد و دڵنیاکران هاتنە سلێمانی...

---

[3] ئەم هەیئەتە من بزانم «میجەر نوئیل» و دوکتۆرێک و= مهندسێک و چەن نەفەرێکی ئینگلیز بوون، چێشتکەرێک و چەن خزمەتکارێکیشیان لە تەکابوو. بەڵام ئەڵێن کە (میجەر دانلیس)یشیان لەگەڵ بووە.

[4] دێیەکی «شێخ مەحمود»ە لە ماوەی نیو سەعاتێکا ئەکەوێتە لای ڕاستی طاسلوجە لەسەر ڕێی چەمچەماڵ و سلێمانی.

ڕەفیق حیلمی

شکاندنی نموونەی (شێخ مەحمود) لەناو عەشایەردا:

نفوزی «شێخ مەحمود» لە سەرەتاوە هەر تایبەتی سلێمانی نەبوو. لە کاتێکا کە ویلسن دوای گفتوگۆ لەگەڵ ڕەئیس عەشیرەتەکان و ناودار و ناسراوەکانی ئەهالی لە (١ تشرینی دووەمی ١٩١٨) بە ناوی حکومەتێکی بەریتانیاوە «شێخ مەحمود»ی کردبوو بە (حکمدار)، جگە لە بەشێکی (جاف)ەکان و (بابکر سلیم ئاغا) لە (پژدەر) کە ئەوانیش هەر لە ژێرەوە دۆستی ڕاستە و ڕاستی ئینگلیز بوون ئەو دوای خەڵقەکە و عەشایر بڕیار و بەڵێنی تەواویان دابوو کە لەگەڵ «شێخ مەحمود» بە ڕاستی بجووڵێنەوە و لاری لە (سلێمانی) مەزبەتەکەیان پێشکەشی «کۆلۆنەڵ ویلسن»ی حاکمی عام کردبوو. لەناو ئەم ڕەئیسانەدا گەلێک لە ڕەئیسەکانی (ئێران)یش هەبوو. ئەمانە لەژێر حوکمی «شێخ مەحمود» داوای یەکخستنی کوردستانی (ئێران) و (عراق)یان ئەکرد. چەرەئیسەکانی کوردی و عراق و چەهی (ئێران) هەر لە بنچینەوە دۆستی «شێخ مەحمود» بوون. ئەمجارە بەم بۆنەیەوە پەیمانی دۆستایەتی و یەکیەتییان لەگەڵ تازە کردبووەوە. لەبەرئەمە بەجێ هێنانی ئەو سیاسەتە کە دوای بەینێکی کەم بە (سۆن) سپێررابوو کارێکی ئەوەندە سووک نەبوو. واتە (سۆن) کە لە ١٩١٩ دا هاتە سلێمانی و دەسی کرد بە شەڕ فرۆشتن بە «شێخ مەحمود»، تێگەیشت کەوا بە ئاسانی گرەوی لێ ناباتەوە و ئەسەردەکانی (ویلسن)ی بەبێ ڕەنجێکی گەورە بۆ ناچێتە سەر. بەڵکو لەم کارە گرنگەدا تووشی گەلێ بەرهەڵست ئەبێ و قورتی گەورە گەورەی دێتە ڕێی!!..

(شێخ ئەمین)ی (سنرۆلاق):

یەکەم تێکۆشانی ئینگلیزەکان بۆ شکاندنی نفوزی «شێخ مەحمود» لە ڕانیە-وە دەستی پێ کرد.. تەقەلای ئینگلیزەکان لەم لایەنەوە هەرچەن بە ئەنجام گەیشت و مەبەستیان هاتە جێ، بەڵام ئەمە زۆر بە گران کەوتە سەریان. هەموومان بە داخەوە ئەیزانین کە لە پێش داهاتنی مەجلیسەکانی (نیابی) و (ئەعیان) دا ئینگلیزە کاربەدەستەکان، گەورە و ڕەئیسەکانیان بە پارە و مەواجب و یا بە هەندێ شتی تری وەکو ئەمانە فریو ئەدا و ئەیانکردن بە دۆست و لایەنگیری خۆیان. لەبەرئەمە تا لەگەڵ «شێخ مەحمود» تێک نەچووبوون و متمانەیان پێ ئەکرد، پارە و خەڵاتی زۆریان بەسەر خزم و دەی پێوەندیان بڵاو ئەکردەوە. بۆ هەندێکیشیان بە ناوی (وەزیفە) وە (مەواجب) یان بڕیبووەوە. «شێخ ئەمینی» (سندوڵان) کە بە خزمایەتی ئەگەیشتە «شێخ مەحمود» یەکێک بوو لەمانە. کرابوو بە قایمقامی (ڕانیە) و (مەواجب)ێکی گەورەیی ئەدرایێ. جگە لەمە بە ناوی (٢٠) پولیسەوە مانگی (٤٠٠) ڕوپیەی تریشی وەرئەگرت کە ئەبوو هیچ نەبێ ئەمە بەسەر نۆکەرەکانی خۆیدا بەش بکا. بەڵام «شێخ ئەمین» ئەمەی نەئەکرد و پارەکەی بەهی خۆی دائەنا. لەگەڵ ئەمەیشدا مانگە و مانگ (قائمە)ی (٢٠) پۆلیسی ڕێکئەخست و ئەیدا بە حکومەت. ئینگلیزەکان دیارە کە ئەمەیان ئەزانی، بەڵام خۆیان تێنەئەگەیاند و چاویان لە زۆر شتی تری وائەپۆشی. ئینجا لە کاتێکدا کە هاتنە سەر ئەوە نفوزی «شێخ مەحمود» کەم بکەنەوە، بە بیانووی ئەم تەرحە شتانەوە کەوتنە وێزەی دەستە و دائرەکەی و چاویان لە هەرچییەک پۆشیبوو خستیانە ڕوو. خەڵقیان لێ هان ئەدان و دوژمنیان لێ ڕاست ئەکردنەوە.

من لەگەڵ (بیل)دا بوو (تەحقیقات)، چووبووینە ڕانیە. کە پتەن (بارکر). ناو معاونێکی ئینگلیزیشمان لەگەڵ بوو. «شێخ ئەمین» خۆی پێش گەیشتنی ئێمە، (ڕانیە)ی بەجێ هێشتبوو و چووبووە (سندوڵان) کە دێیەکی خۆی بوو[5]. لەبەر ئەمە (بیل) ویستی لە هەل کەڵک وەرگریت و بۆ لابردنی «شێخ ئەمین» لە

5 دێیەکە لە بەینی «میرزا ڕۆستەم»، «قەڵادزە« کەوتوەتە سەر ڕۆخی زێی (کۆیی).

قایمقامییەتی تەگبیرێک ڕی بخا. ئینجا ئەم لابردنەی قەیمقام لەو ڕۆژەدا بە سووکی پێک نەئەهات. چونکە پێویستی فرمانی (حکمدار) بوو. ئێمە لە (ڕانیە) لە ماڵی «فتاح بەگ»[٦] میوان بووین. دوای ئەمە نامە نووسرا بۆ هەموو ڕەئیس عەشیرەتەکانی (قەزا)ی (ڕانیە). واتە بۆ ڕەئیسەکانی (مەنگورر) و (مامش) و

(بلباس) و (ئاکویان) و (پژدەر) و (ناودەشت). و بەم ڕەنگە لە جێیەکی وەکو (ڕانیە) دا نزیکەی چوار سەد سوارێک کۆکرایەوە. «حسن أغای» کوری بایز پاشای بەناوبانگی ڕەئیسی مەنکور، «غفور خانی» ناو دەشت و (مەمەندەسوور) و (بالووڵ) و (سواراغا) لەناو ئەم ئاغایانەدا بوون. «فتاح بەگی» خانە خوێمان کە لەوانەبوو بە لاچوونی شێخ ئەمین خۆی بکەن بە قایمقام، ئەوەندەی تر بووبوو بە (حەتەم) و میواندارییەکی ئێجگار پوختە و چاوتێرانەی ئەکرد.

(بیل) ئەی ویست ئەم ئاغا و ڕەئیسانە بڕیاری ئەوە بدەن کە شێخ ئەمین پیاوی قایمقامی نییە و بۆ ئەم کارە دەس نادا.

و (مەزبەتە) ێک ڕێبخەی و مۆری بکەن کە بە دەس (بیل)ەوە ببێت بە بەڵگەی نارەزایی ئەهالی و عەشایرەکە بۆ لابردنی شێخ ئەمین لە قایمقامی، بەڵام ئەم (مەزبەتە)یە نووسرا و لە ماوەی ئەم ٣ ڕۆژەدا (بیل) و (بارکر) هەر تەقەلایەکیان بۆ ئەم مەبەسەدا سەری نەگرت و شتێکیان بۆ نەکرا. گەرمترین بیانوو گرو (سەرپێچی کەر) لە نووسینی ئەم (مەزبەتە) یەدا «غفور خانی»

6 «فتاح بەگ»لاوێکی تازە پێگەیشتووی خەڵقی سلێمانی بوو و هاتبووە ئەو ناوە. دوایی بە وریایی و چاوتێری و= و نیوانداری بوویە گەورەو یەکە پیاوی (رانیە) و باوی لە ئاغایانی (پژدەر) سەندبوو. ئەم لاوە زرنک و جەوگەرە دوای چەن ساڵێک بە هاندانی ئینگلیزەکان بە کوشت چوو.

(ناودەشت) بووە.

زۆر ئازانە وەڵامی ئینگلیزەکانی ئەدایەوە و گیروگرفتی ئەخستە تێکۆشین و تەقەلاکانیانەوە. بە زمانێکی ڕاست و ڕەوان بە ئسلوبێکی ئاگرین ئەهاتە جواب و پێی ئەوتن: «ئێمە سوێند خۆری شێخ مەحمودین و بە حکمداری خۆمان ناسیوە. ئێوەش ئەمە ئەزانن و خۆتان ڕاتان لەسەر بووە و لەبەر ئەمە شێخ ئەمین چاک بێ یان خراپ، ئێمە ناتوانین بڕیاری لابردنی بدەین و ئێمە شیرین نییە کە بە مەزبەتە داوای هەڵگرتنی بکەین. چونکە ئەم کارەمان ئەبێتە هۆی دڵگیری حکمدار لە ئێمە. جگە لەمەش لە ڕاستیدا ئێمە هیچ خراپەیەکمان نییە کە مەزبەتە داوای هەڵگرتنی بکەین. چونکە ئەم کارەمان ئەبێتە هۆی دڵگیری حکمدار لە ئێمە. جگە لەمەش لە ڕاستیدا ئێمە هیچ خراپەیەکمان لە شێخ ئەمین نەدیوە. ئەگەر کارێکی خراپ و ناڕەوای کردووە ئێوە (حکمدار) ئاگادار بکەن! لەوانەیە کە حکمدار خۆی هەڵی بگرێت و کردەوەیەکی بێ جێ لە ئێمەوە ڕوونەدا» لەو لای تریشەوە غفور خان یەکە یەکە چاوی بە ڕەئیسەکانی تر ئەکەوت و بە هەموو هێزییەوە هەوڵی ئەدا تەفرە نەخۆن و مەزبەتە کە مۆر نەکەن. بە ئاغاکانی ئەوت «نەم ئەگوت باوەڕ بەم ئینگلیزانە ناکرێت و هەندەی پێ ناچێت کە بۆ تێکدانی ئەم ئەساسە هەوڵ ئەدەن و دوودڵی و ناکۆکی ئەخەنە ناو مانەوە. یەک لە دوای یەک لە باڵمان ئەدەن. ئەوا قسەکانم دەرکەوت! وەرن مەردی خدا بن با ئیسباتی مەردایەتی خۆ بکەین، تاکو پێمان نەڵێن ئەو کوردانە قەول و شەرەفیات نییە. وەحشینە و ئەحمەقن و تەنیا لوپووڵ و قازانجی خۆیان تێ دەکۆشن. وەرن با رو بە ڕوویان بوەستین و پشتی «شێخ مەحمود»ی بۆ ئەم کافرانە بەرنەدەین».

من، بۆ جاری یەکەم خۆم پێ نەگیرا و بە پێچەوانەی واجباتێک کە لەسەرەم بوو جووڵامەوە. واتە لەگەڵ ئەمەدا کە لە ویستایێکی (وضع) ناسکدا و لە ترس و دەرەکەوە نزیک بووم دیسانەوە دەورێکی وەکو دەورەکەی (غفورخان)م تەمسیل کرد. لە کاتێکدا کە (بیل) و (بارکر) لە وەستانی ڕەئیسەکان بەرامبەر بەم بیرە تێگەیشتن و بۆیان دەرکەوت کە نایانەوێت مەزبەتە کە مۆربکەن، ویستیان کە بە تەنیا و یەکەیەکە ڕەئیسەکان ببینن و گفتوگۆیان لەگەڵ بکەن. لەمە مەبەستیان ئەوەبوو کە هیچ نەبێ هەندێکیان تەفرە بدەن و بەلای خۆیاندا ڕایان کێشن و بەم جۆرە دوو بەکیەتی بخەنە ناویانەوە. بۆ ئەمەیش یارمەتییان لە من داواکرد.

ئەیانویست کە من لە پێشەوە هەندێکیان بە جیا جیا ببینم و تێیان بگەیینم کە ئەم ڕەوشتەیان بەرامبەر بە ئینگلیزەکان جوان نییە و ئەنجامی بۆ خۆیان خراپ ئەبێ و بەم جۆە وایان لێ بکەم کە پێش ئەوەی یەکە یەکە بچنە لای (بیل) کەم و زۆر لە بیری خۆیان بێنە خوارەوە. بەڵام من لەبەر هەرچییەک هەیە بە پێچەوانەی ئەمە جوڵامەوە و وام لێ نەکردن کە مل بۆ ئەم چاوپێ کەوتنە جیاوازە نەدەن.

داخە کەم لە دوای ئەم هەموو تەقەلای بێ سوودە، (بیل) توانی بە هۆی حاکمی سیاسی سلێمانییەوە[7] (تەلگراف)ێک بە شێخ مەحمود بنووسێت کە ڕەئیسەکان (سەرپێچی) نەکەن و بڕیاری لابردنی «شێخ ئەمین» بدەن ئینجا دوای ئەمە بڵاوەیان لێ کرد و هەر کەسە گەڕایەوە جێی خۆ. دیارە لەوەشدا شک نییە کە کردەوەکەی من لە (بیل) نەشارڕابوەوە و پێیان گەیاندبوو.

7 حاکمی سیاسی سلێمانی (میجەرسون) خۆی بوو کە شکاندنی نفوزی شێخ مەحمودی پێ سپێررابوو و (بیل)یش لەسەر ڕاسپێری ئەو (واتە ڕاسپێری سۆن) خەریکی لابردنی «شێخ ئەمین» بوو.

(مێجەرسۆن) لەم کۆبوونەوانە و بەزم و ڕەزمەی ئێمە زۆر قینی ئەبووەوە. هەندێ شەو یەکێک لەوانە کە شکیان لێ ئەکرا لە گەرمەی بەزم و خواردنەوەدا و لە درەنگ وەختا ئەیکرد بە ژووراو سەربەستی ئەو جۆرە ساتانە و چاو قایمی کاتی مەستیانی بە هەل ئەژمارد و بە خەیاڵی شەو و کەمتەرخەمی چیمان لە دەم ئەترازا لە ڕەوانی (پاک!)ی خۆشی شتێکی ئەخستەسەر و ئەیبردەوە بۆ خەفیەکانی (سۆن).

بەڵام لەگەڵ ئەمەشا کە لە ئێمە بەکین بوو و چارەی نەئەویستین دیسانەوە بە مەرامی ئەو خەفیانەی نە ئەکرد و لێمان ئەبوورد. و یا بە پێویستی نەئەزانی کە پەلە بکا و هەڵی ئەیگرت بۆ کاتی خۆی. ئەگەر ڕاستت ئەوێ ئێمە دەم درێژیمان ئەکرد و زیاد ئەڕۆیشتین. بەتایبەتی لە نیوەشەو بەولاوە و لە کاتێکا کە سەرمان گەرم ئەبوو بە جارێ شووڵمان لێ هەڵ ئەبڕی و لە شیرازەوە ئەچووینە دەرەوە. خەفیەکانی بەوە شەقیان ئەبرد کە زوو زوو ڕانەئەکێشراینە ناو چاوی پۆلیس و داخی دڵی خۆیان پێ نەئەڕشتین. ئەم خەفیانە زۆرتر لە من و (ماجد مستەفا) و (مەحمود جەودەتی) خوا لێخۆشبوو بە داخ بوون. لەبەرئەمە (سۆن) ئەیویست ئێمە (عاقڵ) بکا. بەڵام بۆ هەلێ ئەگەڕا. یەک دوو جاریش بیانوویان پێ گرتین و چووینە پۆلیسخانە. بەڵام تێیان هەڵ نەداین. چونکە ئەیان زانی کە لەناو خەڵقا خۆشەویستین و ناوێکی باشمان هەیە. ئەوانیش کە ئەچووینە لایان بێگانە نەبوون و کەم و زۆر شەرمیان لێ ئەکردین.

(سۆن) کەم دەرئەکەوت و بەمە ئەیوسیت (سام) ێک بە خۆی پەیا بکا. کە دەریش ئەکەوت و یا بە

ڕەفیق حیلمی

بازاڕا ئەڕۆیشت ئەبوو خەڵقەکە بە جارێ هەستنە سەر پێ و ڕێبوار (کڕنوش)ی بۆ بکا....

من و (ماجد) شەو و ڕۆژ پێکەوە بووین و زۆر کەم لە یەک جیا ئەبووینەوە. هەموو کاتێک ئەوەمان لە یادابوو کە خۆمان لە (سۆن) بپارێزین. کە لە دوورەوە بە (دی)مان ئەکرد ڕێگەمان ئەگۆڕی و خۆمان لێ لائەدا. چونکە نەمان ئەویست (کوڕنوش)ی بۆ بکەین، لەوەش ئەترساین کە لێمان نەبوورێ و تەرنێکمان پێ بدا. بەڵام ڕۆژێک (لووت)مان بوو بە لووتییەوە. لە دەشتی (ئەحمەدی عیساغا) گەڕۆکەکەی (سەییارە) وەستابوو. پیاوەکەی خەریکی بوو بیخاتەکار. خۆشی بە دیارییەوە چاوەڕوان بوو. لە ناکاو خۆمان لەبەر دەمیا چاو پێکەوت. ناچار ماینەوە تێپەڕین. بەڵام سەڵاومان بۆ نەکرد. نەمان ئەزانی کە حسابی ئەمەشمان لەگەڵ ئەکا. (سون) لە حەمە درێژی[8] پیاوی خوری، وتی ئەوانە بانگەکە! «حەماغا» ڕووی کردە ئێمە وتی، ئاوەرن! جەنابی حاکم ئێوە داوا ئەکا. من ویستم بچمە پێشەوە. بەڵام (ماجد) نەیهێشتە بەر من و خۆی چووە بەردەمی... سۆن، وتی: من ناناسن؟ ماجد، وتی: بەڵێ ئەتناسین جەنابت «مێجەرسۆن» حاکمی. وتی: کەوابوو چۆن سەڵاو ناکەن و تێئەپەڕن؟ ماجد، وتی هەر کاتێک هاتین بۆ کارێک ویا عەرێزەێکمان دا بۆ (وەزیفە)ێک بۆمان مەکە. ئینجا وەرگەڕایەوە بۆ لای من و ملی ڕێگەمان گرت. سۆن ئیتر دەنگی نەکرد. لە ماجدم پرسی کە بۆچی نەیهێشت من لە (سۆن) بچمە پێشەوە؟ وتی، تۆ تورەی، ترسام بە هێمنی و شێنەیی وەڵامی نەدەیتەوە. (ماجد) لەو دەورەدا لاوێکی خوێن گەرم و هەڵەشە بوو لەناو نیشتمان پەروەرەکانا بە ئەنگوشت پیشان ئەدرا...

دوای بەینێک (سۆن) لە لاوەکان بە تەواوی پەست بوو بوو. (حاجی ئاغای حەسەن ئاغای تفەنگچیی باشی) لەو دەمەدا مودیری پۆلیس و (ماک برایت) ناو چاوەشێکی ئینگلیز (مودیری ئیستیخبارات) و یا (گەورەی پۆلیس) بوو. (سۆن) و (ماک برایت) خۆیان لە حاجی ئاغا تۆراند. ئەویش بە قسە (إستقالە)ی داو دەسی لە مودیری هەڵگرت و بەرگی گۆڕی. تا ئەو ڕۆژە هاتە لای من. بەڵام ئەو ڕۆژە لە ڕێوە هاتە دوکانەکەی من و دەسی کرد بە سکاڵا و جوێن دان بە (سۆن) بەڵام من خۆم لێ هەڵە کرد. وام تێگەیاند کە دەرچوونیم پێ خۆش نەبووە.

بۆ ئەمەش کە باوەڕ بکا پێم وت ئێمە هەموومان ئەزانین کە ئەگەر ئەو مودیر نەبوایە (سۆن) و (ماک برایت) زۆریان عەزیەت ئەداین و تووشی گەلێ گێچەڵ ئەبووین. ئینجا تکای ئەوەم لێ کرد کە تا زووە هەوڵێ بداو بچێتەوە جێگەکەی خۆی. نەک پیاوێکی بێ ڕەوان (وجدان) بێتە ئەو شوێنە. وا بزانم بە تەواوی بە وتەکانم باوەڕی نەکرد، بەڵام ئیتر لێشم گەڕا و نەهاتەوەلام.

دوای ئەو بە چەن ڕۆژێک مستەفای حاجی برایم ئاغای خۆمان کە ئەو سەردەمە قۆمیسەر (موفەزەز) بوو خۆی گۆڕی. ڕۆژێکیان لە (چایخانەکەی مەجولێ خامەسنەیی) هاتە تەنیشتمەوە و بە دزییەوە پێی وتم کە ئاگامان لە خۆمان بێ و لەناو خەڵقا دەممان بپارێزین. لەژێریشەوە چاوی لێ داگرتم وتی: خەفیە[9]تان بەسەرەوە دانراوە.

ئەم دەورەش بەسەرچوو. (حاجی ئاغا) و (کاک مستەفا) گەڕانەوە سەر (وەزیفە) بەڵام لەوەدا شکم نییە کە چە (مودیر) و چە (مستەفا حاجی برایم ئاغا) خراپەیان دەربارە نەکردین... بەینێکیش (عەونی حاجی گورون) کرا بە مودیری پۆلیس. مێجەر (سۆن) وای لێ هاتبوو نەیئەزانی چی بکا؟ جارێ (ئەو ڕەحمان سەعید[10]) و دوای (ماجد مستەفا) و (مەحمود جەودەت)ی ڕەحمەتی گرت و

8 حەمە درێژ کە لە زمانی حوکمی (مێجەر سۆن) بوو بوو بە (حەماغا) لە پێشا پیاوی ماڵی (حاجی حەسەن ئەفەندی) بوو. کە سۆن بە خۆگۆڕینی بەرگی (خەفیە) هاتبووە کوردستان (حەمە)ی ناسیبوو و لەگەڵ ئەو پێکەوە کاسپی سەر پێیان کردبوو و بە هەندێ دێهات و ناو عەشایرا گەڕابوون.

9 خەفیە واتە سرری.

10 ئیمڕۆ ڕەئیسە مەحکەمەی ئیستیئنافە لە کەرکوک.

خستنییە (بەندینخانە)ەوە. (عەونی) پیاوێکی خراپ نەبوو. دوای گیرانی ئەوان کە ئەیزانی (سۆن) خەریکی گرتنی کەسێکە جوابی بۆ ئەنارد کە خۆی دەربازکا و یا بشارێتەوە. تۆفیق وەهبی لەم ڕۆژانەدا چووە بەغدا و لەوێ لە (جەیش)ی عراقا بوو بە زابت. ڕۆژێک من لە دووکان بووم کە ئەحمەد ئاغای کرکوکی زادە ناردی بە شوێنما. وتی: (عەونی) ئەڵێ نۆرەی گیرانی توو(رفیق) هاتووە. وتم: ئینجا ئەڵێی چی؟ وتی: وڵاخ ئامادەکراوە، ساتێکی تر نان ئەخۆین و ئەچینە (بەغدا). پاش نیوەڕۆ بوو کە خۆم ئامادە کردبوو. من و ئەحمەد ئاغا و ئەحمەدی سەعەی فتاح بە سواری وڵاخ و بەڕێی

(سەگرمە) دا ڕوومان کردە بەغدا. شەو لەسەر ڕێ لامان دا و ماوەی سەعاتێک بە لەپەوە و لەناو (درکەڵان)ێکا سەرخەوێکمان شکاند. جڵەوی وڵاخەکانمان بە دەسمانەوە بەستبوو. لە نیوە شەودا دووبارە ڕێمان گرتەبەر. لەگەڵ هەتاو کەوتن لە (بێستان)ەکانی گوێ چەمی داوێنی شاخەکەی (ئیمام شاسوار) (شووتی)مان کڕی و خواردمان ئینجا چووینە شاری (کفری)یەوە. (شەمەنەفەر) لەو ڕۆژەدا تا کنگریان هەبوو. لەوێوە دوای تاقەکردنی وڵاخەکانمان لە ماڵی عباس ناوێکی کاروانچی ئاشنای ئەحمەد ئاغا بە (شەمەندەفەر) چووینە بەغدا.

لێرەدا بەتێ هەڵکێش باسێکی کۆنی زەمانی (عوسمانی)م کەوتەوە یاد. باوکم لە کفری (زابت) ی ڕەدیف بوو. من ئەو وەختە لە مەکتەبی ئیبتیدائی ئەم خوێند. برایەکم بچووکم هەبوو ناوی (جەمیل) بوو. هێشتا بە بەر مەمکەوە بوو. بەڵام زۆر ئێسک سووک و جوان بوو و من

ئێجگار خۆشم ئەویست. تووشی نەخۆشی (باژەڵە) هات. لەو وەختەدا باوکم بۆ سەندنی (دەیەک)ی بررشتی[11] ئەملاکی سەنیە چووبووە دەرەوە. دوکتۆر نازانم هەبوو یا نە؟ بەڵام نەخۆش ڕێی نەخۆشخانە و لای دوکتۆری نە ئەزانی. زۆرتر پر و پیرێژنان دەرمانی نەخۆشیان ئەکرد. شێخ و مەلا (نوشتە) یان بۆ ئەنووسین و (دۆعا)یان بەسەرا ئەخوێندن. دەلاک بە (نەشتەرە) پیس و چڵکن و ژەنگاوییەکانیان (دوومەڵ) و برینەکانی ئەم و ئەویان ئەدڕی و (کێم)یان پێ ئەکرد. کەس نەی ئەزانی کە (کانگرەن) چییە و بە چی ئەڵێن؟ بە گازە زل و ئەستوورە ئاسنەکانیان کە بە زۆر بە دەمی زەلامێکیانا ئەبردە ناوەوە (دان)ە خرێ-کانی ساغ و سەلیمی خەڵقیان بەبێ (بەنج) و بە پێوە لە ڕیشەوە ئەهێنایە دەرێ. هەندێجار شەو و ڕۆژێک خوێنی نەئەوەستایەوە. چونکە ناوی (نەزیف) لەو ڕۆژەدا لەناو ئێمەمانانا نەبیسترابوو. ئینجا (جەمیل)ی کۆرپە و بەسەزمان و بێ تاوان لە ناوچەیەکی دواکەوتووی وەکو ئەو ڕۆژەی (کفری) و لە باوەشی دایکێکی نەخوێندەوارا تووشی نەخۆشییەک بوو بوو کە لەو دەورەدا پێیان ئەوت (باژەڵە). (پووره ڕەحمە) خوشکە بێوەژنەکەی دایکم کە هەموومان (باجی ڕەحمە) مان پێ ئەوت گەورەی ماڵ و سەرسپی و (ڕابەر)مان بوو. هەرچەن (جەمیل) لەناو ئازاری ڕان و ئەژنۆکانی ئەیزریکاند (باجی ڕەحمە) ئەیگرتە باوەشی. منیش شوێنی ئەکەوتم بۆ ماڵی و یا دووکانی دلاکێک و بەو (نەشتەرە) کە باسم بۆ کردن ئەو جێگە ئازارەی کە ئاوسا بوو بە لای کەمەوە نزیکەی (پەنجە تووتە)ێکی لێ هەڵ ئەدڕی. ئەم (عەمەلیات)ە کە نەمان ئەزانی (جنایەت)ێکە ئەیکەین چەن ڕۆژێک دووبارەکرایەوە. هەموو جارێ تا ئەگەیشتینە ماڵەوە تەنیشتەکانی برینی نەشتەرەکە ئەوەنەیتر ئەئاوسا و بۆ ڕۆژی دووەم دەمی برینەکەش بە کێمی زەرد و شین دائەپۆشرا.. وەخت هاوین بوو لە سەربان ئەنووستین. شەوێک لە نزیک بەیانا لە دەنگی گریانی دایکم و باجی ڕەحمە لە خەو خەبەرم بووەوە. (جەمیل) مردبوو..!

دراوسێکان و ئاشناکان کۆبوونەوە. تا ناردیان یەکێک بێت و (جەمیل) بشوا، (موبارەک ئەفەندی) خەڵقی کفری ڕەفیقی زۆر دڵسۆزی باوکم کە پیاوێکی ناودار و بە ڕێزی کفری بوو[12] خۆی هات و (جەمیل)ی ششت و (کفن)ی کرد. نەمان ئەزانی لەو ڕۆژەدا باوکم لە کام (دێ)یە. لەبەرئەوە هەرچەن گەلێک دۆست و شوناسمان لێ کۆبووەوە، بەڵام –داخەکەم- باوکی (جەمیل) لە بەرێخستنی مەیتەکەیا دیارنەبوو. گۆڕستانەکەی کفری ئەکەوتە داوێنی (ئیمام شاسوار). قەدپاڵی شاخەکەش تاک و تووک قەبری لێ ئەبوو کە ئەمانە تا ئەگاتە (گومەز)ەکەی ئیمام شاسوار سەرەو ژوور ئەبووەوە. دایکم ئافرەتێکی نوێژکەر و بە دین بوو. ویستی کە (جەمیل)ی جوانەمەرگ بخەینە ژێر باڵی چاودێری (ئیمام)ەوە. لەبەرئەوە لەناو قەدی شاخەکە و نزیک (مەرقەدەکەی ئیمام شاسوار (جەمیل)مان خستە خاکەوە (٣٢٤ڕۆمی) کە باوکم گەڕایەوە کفری من لەگەڵی چوومە زیارەتی قەبرە بچکۆلەکەی (جەمیل) تا ئەو ڕۆژە نەم ئەزانی کە (عەسکەر) ئەگریی. بەڵام کە فرمێسکە گەرمەکانم دیی چۆن بە چاوەکانی باوکما ئەهاتە خوارەوە باوەڕم کرد کە (عەسکەر) یش کزەی جەرگی کەوتە ژێر خاکەوە خۆی پێ ناگیرێ و ئەگریی...!

11 دەیەکی بررشت (عوشری حاصلات= ئەعشار)، ئەملاکی سەنیە= ئەرازی و ئەملاکی سلطان عبدالحمید).

12 مووبارەک ئەفەندی برا گەورەی مصطفی ڕێژی باوکی (مدحەت)ی (مودیری تەحریرات)ی ئیمڕۆی سلێمانی بوو.

# نامەیەکی مێژوویی «ڕەفیق حیلمی» دەقی ئەسڵیی (عەرەبی)ی نامەکە:

سدیقساڵح

معالی ماجد بک المحترم سليمانية، ١٩/٢/٤٤

عزيزى، لقد طلبتم الىَّ ابداء رأيى حول الاصلاحات المقتضية فى المناطق الكُردية لتنظيم ماكنة الادارة والسياسة تأميناً لتوجيه الشعب الكُردى نحو الهدف المنشود الا وهو تقوية الروابط بينه وبين اخوانه العرب من جهة واطمئنانه الى نيّات الحكومة الحسنة وركونه الى الهدوء والسكينة فى كل الادوار من جهة اخرى. ولكننى قد تأخرت مدة من الزمن وتماطلت كثيراً فى تقديم آرائى لمعاليكم وذلك لا لعدم اعتمادى على نواياكم أو لاعتقادى بأن فى الامر مالم يشبه ظاهره باطنه، حيث قد مرّت على هذا الشعب خلال العشرين سنة الماضية تجارب قاسية درّبته على تقدير الموقف ومرّنته على كيفية الاتقاء من شرور الحركات المضلّلة، فلا يوجد هناك كردى قد أعماه الجهل الى درجة يصعب معها عليه التمييز بين الحق والباطل وبين الواقع الملموس والغش والخداع. الاّ ان اهمية الموضوع قد جعلتنى أتردد كثيراً فى التسرع فى ابداء ملاحظات شخصية قد تكون تافهة وبعيدة عمّا تصبو اليها نفسكم، خاصة وان بضاعتى العلمية والسياسية قد لاتساعدنى على الإحكام فى المرمى. غير ان الحاح معاليكم وايعاز البعض من محبى الاصلاح، خاصة الغيورين على مصلحة العراق منهم، مما اضطرنى الى التفكير فى الموضوع تفكيراً مبنيّاً على لزوم وضع مصلحة البلاد وفق كل الاعتبار ومما جعلنى أنزل الى ميدان الخدمة بجرأة وشجاعة تامتين. فأن اول شيئ قمت به هو التطلع الى آراء المفكرين من الاكراد، بعد ان تأكدت من ان الرجال المسئولين عن تدوير سياسة الدولة هم على استعداد للقيام بالاصلاحات التى ترغبون عرضها عليهم. فوجدت ان الآراء منقسمة الى اقسام تختلف بعضها عن بعض اختلافاً عظيماً، الاّ انه من الممكن حصرها فى قسمين مهمّين كما يأتى:

١– الرأى القائل بلزوم تنفيذ ما تعهدته الحكومة العراقية تجاه الكُرد عند دخولها كعضو فى عصبة الامم وأدرجته فى صلب الدستور دون قيد او شرط ودون خلق المشاكل او استعمال سياسة التضليل والمماطلة فى تطبيقها، على ان يكون الموظفون المنزّهون من الاكراد هم المشرفين على تنفيذها، مع القيام باصلاحات جدّية فى معارف المنطقة الكُردية وذلك بفصلها فصلاً تاماً عن وزارة المعارف لتتمكن من وضع مناهج خاصة لمدارس الشمال ومن تغير انظمة الامتحانات واحضار الكتب الموافقة لحاجة المنطقة الروحية والاجتماعية والاشراف على حصة ابناء الكُرد من البعثات ولرفع الضغط عن الشعور القومى المكبوت وامكان توجيهه حسب سياسة الدولة العُليا مع القيام باصلاحات اخرى مماثلة لها فى بقية النواحى الادارية والاقتصادية والزراعية كتشكيل لوائين آخرين من المناطق الكُردية المشمولة بقانون اللغات المحلية وتعديل نظام انتقاء الموظفين الاداريين لهذه المنطقة وافساح المجال امام الكُرد لانتخاب مندوبيهم من اللذين يطمئنون اليهم ويوثقون بهم كرسل امناء قد يتمكنون من ايصال شكاويهم ومطاليبهم المشروعة الى آذان الحكومة عن طريق المجلس وغيرها التى اعتقد انها قد عرضت كلها أو بعضها على مختلف الحكومات العراقية السابقة بتقارير خاصة مفصلة من رجالات الكُرد البارزين كمعالى امين زكى بك وعلى كمال بك وجمال بك بابان وغيرهم، فأنى –اجتناباً من التطويل– اشير على معاليكم التفضل بمراجعة تلك التقارير التى لابّد وانها محفوظة فى اضبارات الدولة او موجودة لدى اصحابها وذلك للاطلاع على تفاصيلها مرة آخرى.

-٢ أما الرأى الثانى فهو التجنب عن كل مايحدث سوء التفاهم بين الكُرد والعرب فى العراق مع السعى لاقناع الرجالات المسئولين تدريجاً بضرورة احداث تغيير كافٍ فى سياسة الدولة وفى شكل الحكم فى المنطقة الكردية وذلك عن طريق التفاهم الودّى المبنى على الاخلاص التام تجاه العرش وتجاه وحدة البلاد. وقد لايتم هذا فى نظر القائلين بالرأى الثانى الاّ بعد أن تحصل القناعة الكافية لدى المشتغلين بسياسة البلاد حول لزوم القيام بالاصلاحات الاساسية المنشودة. فعند ذلك قد لايصعب على الحكومة اصدار بيان او تصريح رسمى مع دعوة ممثل مختلف الطبقات من الشعب الكردى فوراً للاشتراك فى مؤتمر ينعقد تحت رئاسة احد كبار موظفى الدولة (انطليزياً كان أو عراقياً)، على ان يمثل فيه جانب العرب رجالات بارزين من المشتغلين بالسياسة العراقية وبسياسة الدولة، وبهذه الصورة قد تكون مقررات المؤتمر الصادرة حول الاصلاح المتفق عليه مفرغة؟ (أو مفزعة؟) فى الشكل الذى يلائم السياسة العليا ومطابقة لمرضاة الجانبين الكردى والعربى بدلاً من أن تكون سبباً لاثارة الشغب والفتن أو داعياً للانحراف عن السياسة المرسومة للدولة. كما انه سوف لا يوسّع شقة الخلاف بين الشعبين أو بين الكُرد والحكومة، بل انّما يمنع الاضطرابات التى قد تتولد من المطاليب والمقترحات الصادرة حول الاصلاح من الجانب الكردى وحده، دون ان يكون ]هناك[ أى استعداد لقبول هذه المطاليب من الجانب الاخر (الجانب العربى او الجانب الحكومى). خاصة وأن المطاليب التى تصدر من الاكراد قد تكون خارجة عن نطاق سياسة الدولة ومضرّة بمصالحها، او قد تكون اقل من الحاجة الماسة لتأمين رضاء الشعب الكُردى واخلاءهم الى السكينة اخلاءاً تاماً، وذلك فيما اذا كانت تلك المطاليب صادرة من جانب واحد أو من قبل اشخاص معدودين قد لايحق لهم تمثيل الشعب الكردى العراقى بأجمعه. هذا بصرف النظر عمّا ستولّد تلك المطاليب (مشروعة كانت أم غير مشروعة) من الضغائن والاحقاد والفتن بين هذين الشعبين الذين ما فتأت رجالاتهما البارزين يحاولون بثّ روح التآخى والتصافى بينهما بكل ما اوتوا من قوة. واخيراً اصارح معاليكم بأننى اشارك شخصياً اصحاب هذا الرأى وأرى انه من أنسب الآراء وانضجها التى قد يؤدى الاخذ به الى الاصلاح المنشود والى حصول التفاهم التام بين الشعبين الذين من الضرورى تآخيهما وتعاونهما على الدوام. وبالنهاية اتمنى لمعاليكم التوفيق فى مهمتكم الشاقة وأرجو للأمة وللبلاد التقدم والنجاح المستمرين.

ملاحظة: اننى قد اهملت الآراء المتطرفة لعدم موافقتها لآرائى الشخصية من جهة ولعدم ملائمتها طبيعة الظروف الحاضرة.

المخلص

رفيق حلمى

## کوردییەکە

## پایەبەرزی بەڕێز، ماجید بەگ٢

## سلێمانی ١٩/٢/٤٤٤

ئازیزم، داواتان لێکردبووم بۆچوونی خۆم سەبارەت بە چاکسازییە پێویستەکانی ناوچەی کوردنشین بخەمە ڕوو بۆ ڕێکخستنی بەڕێوەبردن و سیاسەت، تا لە لایەکەوە ڕێنوێنیی گەلی کورد مسۆگەر بکرێ بەرەو ئامانجی خواستراو کە پتەوکردنی پێوەندییەکانی نێوان خۆی و برا عەرەبەکانیەتی، لە لایەکی دیکەوە لە نیازپاکیی حکومەت دڵنیا ببێ و لە هەموو قۆناغێکدا ڕوو بکاتە هێمنی و ئارامیی ژیانی خۆی[4].

بەڵام من ماوەیەک دواکەوتم و زۆر بەتەمام کردن تا بۆچوونەکانم پێشکەش بە پایەبەرزتان بکەم، ئەویش لەبەر ئەوە نا کە پشتم بە نیازەکانتان ئەستوور نییە، یا پێم وابێ مەسەلەکە شتێکی تێدایە دیوی دەرەوەی لە ناوەوەی ناچێ، لە کاتێکدا ئەم گەلە لە بیستساڵی ڕابوردوودا زۆر ئەزموونی قورسی بەسەردا تێپەڕیوە، کە ڕایان هێناوە هەلومەرج مەزەندە بکا و فێریان کردووە چۆن خۆی لە خراپییەکانی جموجووڵە چەواشەکارەکان بپارێزێ، چونکە کوردێک نییە نەزانێ تا ئەو ڕادەیە کوێری کردبێ، کە زەحمەت بێ بتوانێ هەق و ناهەق و واقیعی بەرچاو و فڕوفێڵ و هەڵخەڵەتاندن

1–ئەم وشەیە لە دەستخەتەکەدا بە (مفرغة) یا (مفزغة)یش دەخوێندرێتەوە، کە هیچیان –بەپێی مەبەستی ڕستەکە– بۆ ئێرە دەست نادەن، بۆیە هەڵەن و دەبێ مەبەست (مقنعة) یا شتێکی لەو بابەتە بووبێ کە بۆ ئەو جێیە گونجاوە.

لێک جویێ بکاتەوە.

بەڵام بایەخی بابەتەکە وای لێکردم زۆر دوودڵ بم و پەلە نەکەم لە خستنەڕووی چەند تێبینی و سەرنجێکی خۆم، کە ڕەنگە هیچ و بێمانا و دوور بن لەو مەبەستەی وا ئێوە دەتانەوێ، بەتایبەت کە لەوانەیە کالاَ زانستی و سیاسییەکەم یارمەتیم نەدا بە وردی و لێزانانە ئامانج بپێکم. لەگەڵ ئەوەیشدا، پێداگرتنی پایەبەرزتان و پێراگەیاندنی هێندێ لایەنگری چاکسازی، لەوانە -بەتایبەت- بەتەنگەوەهاتوانی بەرژەوەندیی عێراق، ناچاریان کردم بیر لە بابەتەکە بکەمەوە، بیرکردنەوەیەکی هەڵچنراو لەسەر بەرژەوەندیی وڵات خستنە بان هەموو شتێکی دیکەی ڕەچاوکراو و وایان لێکردم بە لەخۆڕادیوی و ئازایەتییەکی تەواوەوە بێمە مەیدانی خزمەت. یەکەمین کارێک کە کردم، بەسەرداچوونەوەی بیروڕای بیرمەندانی کورد بوو، پاش ئەوەی دڵنیا بووم کە کاربەدەستانی بەرپرسی ڕاپەڕاندنی سیاسەتی دەوڵەت ئامادەی بەجێهێنانی ئەو چاکسازییانەن، کە ئارەزووتانە بیانخەنە بەرچاویان. سەرنجم دا بیروڕاکان بەسەر چەند بەشێکدا دابەش بوون و جیاوازییەکی زۆر لە نێوانیاندا هەیە. بەڵام دەکرێ لە دوو بەشی گرنگدا، وەک لە خوارەوە دیاری کراوە، کورت بکرێنەوە:

١- ئەو بۆچوونەی کە دەڵێ: پێویستە حکومەتی عێراق هەموو گفت و پەیمانێکی بەرامبەر بە کورد، وەک لە ناوەرۆکی دەستووردا نووسیویە، جێبەجێ بکا، کاتێک وەک ئەندام دەچێتە ناو (کۆمەڵەی نەتەوەکان)،

رفيق حلمي
خلاصەی مسئلەی کورد
لە کتێبی : عراق وعصبة الامم
«L'IRAQ» et la «société des nations»
ترجمە کاده
موصل
١٩٣٤

ئەویش بەبێ قەیدوشەرت و بەبێ کێشەنانەوە و بەکارهێنانی سیاسەتی سەرلێشێواندن و دەستیدەستپێکردن لە جێبەجێکردنیدا، بە مەرجێک فەرمانبەرانی دەستپاکی کورد سەرپەرشتیی جێبەجێکردنی بکەن. وێڕای چاکسازیکردنی جیدی لە مەعاریفی ناوچەی کوریدا، ئەویش بە بەتەواوی جوێکردنەوەی لە وەزارەتی مەعاریف، تا بتوانێ بەرنامەی تایبەت بۆ قوتابخانەکانی باکوور دابنێ و سیستمی تاقیکردنەوە بگۆڕێ و کتێبی کوردیی لەگەڵ پێویستییە گیانی و کۆمەڵایەتییەکانی ناوچەکەدا گونجاو ئامادە بکا و لە قوتابی ناردنە دەرەوەیشدا چاودێریی پشکی ڕۆڵەکانی کورد بکا و تەنگهەڵچنین بە هەستی خەفەکراوی نەتەوەیی نەهێڵێ و بشێ بەپێی سیاسەتی بەرزی دەوڵەت ئاڕاستەی بکا. سەرباری دەستپێکردنی چاکسازیی دیکەی هاوشێوە لە لایەنەکانی بەڕێوەبردن و ئابووری و کشتوکاڵدا، وەک پێکهێنانی دوو

ڕەفیق حیلمی

مترجم: رفیق حلمی

ژماره — ١

نامیلکەی کومەڵایەتي

نوسینی زاناي گەورەی کورد

مرحوم

ضیاء گوك آلپ بك

« ماموستای پیشوی علومی اجتماعیه لە دار الفنون استەموڵ »

موصل

لە چاپخـانەی دجلة لە چاپ دراوە

١٩٣٤

نرخي ١٠ فاسە

لیوای دیکە لەو ناوچە کوردییانە کە قانوونی زمانە خۆجێییەکان دەیانگرێتەوە و دەستکاریی سیستمی دەستنیشانکردنی فەرمانبەرانی بەڕێوەبردن بۆ ئەم ناوچەیە و دەرفەتڕەخساندن بۆ کورد تا نوێنەرەکانی لەو کەسانە هەڵبژێرێ، کە لێیان دڵنیایە و وەک نێردراوی متمانەپێکراو بڕوایان پێدەکا، کە لەوانەیە بتوانن سکاڵا و داوا ڕەواکانی لە ڕێی ئەنجومەن و ڕێگەی دیکەوە بە گوێی حکومەتی عێراقدا بدەن. پێم وایە ئەم خاڵانە هەموویان یا هێندێکیان بە ڕاپۆرتی تایبەت لە لایەن گەورەپیاوانی ناوداری کوردەوە، وەک پایەبەرز ئەمین زەکی بەگ[5] و عەلی کەمال بەگ[6] و جەمال بەگی بابان[7] و کەسانی دیکە، خراونەتە بەردەستی حکوومەتە جیاجیاکانی پێشووی عێراق. منیش -بە خۆلادان لە درێژدادڕی- داوا لە پایەبەرزتان دەکەم بفەرموون بەو ڕاپۆرتانەدا بچنەوە، کە هەر دەبێ لە دۆسییەکانی دەوڵەتدا پارێزرابن یا لە لای خاوەنەکانیان هەبن، تا جارێکی دیکە ئاگاداری وردەکارییەکانیان بن.

٢- هەرچی بۆچوونی دووەمە، خۆبەدوورگرتنە لە هەر شتێک ببێتە مایەی خراپ لێکتێگەیشتنی نێوان کورد و عەرەب لە عێراق و هەوڵدانە بۆ بەرەبەرە قەناعەتهێنان بە کاربەدەستانی بەرپرس کە گۆڕینی سیاسەتی دەوڵەت و شێوەی حوکم لە ناوچەی کوردیدا کارێکی ناچارییە، ئەویش لە ڕێی لێکتێگەیشتنێکی دۆستانەوە کە لەسەر بناغەی دڵسۆزیی تەواو بەرامبەر بە تەختی شاهانە و یەکێتیی وەڵات بنیات نرابێ. ڕەنگە ئەمە -بە تێڕوانینی لایەنگرانی بۆچوونی دووەم- جێبەجێ نەبێ، تا پاش ئەوەی هەڵسووڕاوانی سیاسەتی دەوڵەت قەناعەتی تەواو پەیدا دەکەن کە پێویستە چاکسازیی سیاسیی خواستراو بکرێ. ئەوسا ڕەنگە بۆ حکومەت گران نەبێ بەیاننامەیەک یا ڕاگەیاندراوێکی ڕەسمی دەربکا و دەستبەجێ بانگی نوێنەرانی چینە جیاجیاکانی گەلی کورد بکا بۆ بەشداری لە کۆنگرەیەکدا کە بە سەرۆکایەتیی گەورەفەرمانبەرێکی دەوڵەت (ئینگلیز بێ یا عێراقی) ببەسترێ، بە مەرجێک پیاوانی دیار و هەڵسووڕاوی سیاسەتی عێراق و سیاسەتی دەوڵەتی تێدا ببنە نوێنەری لایەنی عەرەب. بەم پێیە، لەوانەیە بڕیارەکانی کۆنگرە سەبارەت بەو چاکسازییە کە لەسەری یەککەوتوون، بەو شێوەیە کە بۆ سیاسەتی بەرزی حکومەت دەست دەدا، (مایەی قەناعەت؟) بن و لەباتیی ئەوەی ببنە هۆی ئاژاوە و ناکۆکیبەرپاکردن، یا داوای بەلاڕێدابردنی سیاسەتی ڕەنگبۆداڕێژراوی دەوڵەت، لەگەڵ ڕەزامەندیی هەردوو لایەنی کوردی و عەرەبیشدا جووت بێنەوە. هەروەها نەک هەر جیاوازی و ناتەبایی نێوان هەردوو گەل، یا نێوان کورد و حکومەت قووڵتر ناکەنەوە، بەڵکو دەبنە ڕێگری ئەو پشێوییانەیش کە لە ئەنجامی داوا و پێشنیازەکانی تەنیا لایەنی کوردییەوە سەبارەت بە چاکسازی پەیدا دەبن، بەبێ ئەوەی لایەنەکەی

دیکە (عەرەب یا حکومەت) هیچ ئامادەگییەکی بۆ قبووڵکردنی ئەم جۆرە داوایانە هەبێ؛ بەتایبەت کە ڕەنگە داواکانی کورد لە چوارچێوەی سیاسەتی دەوڵەت چووبنە دەرێ و زیان بە بەرژەوەندییەکانی بگەیێنن، یان وێدەچێ لەوە کەمتر بن کە پێویستیی گرنگیی ڕەزامەندیی گەلی کورد دابین بکەن و بیخەنە سەر باری هێوربوونەوەیەکی تەواو. ئەویش کاتێک یەک لایەن یا کۆمەڵە کەسێکی دیاریکراو کە لەوانەیە مافی نوێنەرایەتیکردنی تێکڕای گەلی کوردی عێراقیان نەبێ، ئەو داوایانەی هەبێ. ئەمە بە چاوپۆشین لەوە کە ئەم داوایانە (ڕەوا بووبن یا نارەوا) چ ڕق و کینە و دووبەرەکییەک لە نێوان ئەم دوو گەلەدا دەخولقێنن، لە کاتێکدا پیاوە گەورەکانی هەردوولا هێشتا بە هەموو هێزێکیانەوە هەوڵ دەدەن گیانی برایەتی و ئاشتی لە نێوانیاندا تەشەنە پێبدەن.

دواجار بە ڕاشکاوی بە پایەبەرزتان ڕادەگەیێنم، من خۆم هاوڕای ئەوانەم کە ئەم بۆچوونەیان هەیە [دووەم] و پێم وایە گونجاوترین و کامڵترین بۆچوونیانە و ڕەنگە ڕەچاوکردن و بەجێهێنانی بکێشێتەوە بۆ هەم بەدیهێنانی ئەم چاکسازییە داواکراوە و هەم پەیدابوونی لێکتێگەیشتنێکی تەواو لە نێوان هەردوو گەلدا، کە ناچارییە دەبێ برا بن و هاوکاریی بەردەوامی یەکتر بکەن[8].

لە کۆتاییدا ئاواتەخوازی سەرکەوتنی پایەبەرزتانم لەم ئەرکە قورسەتاندا و تکاکاری پێشکەوتن و سەرکەوتنی بەردەوامی نەتەوە و وڵاتم.

سەرنج: من بۆچوونە توندەکانم وەلانا، چونکە لە لایەکەوە لەگەڵ بۆچوونی تایبەتی خۆمدا ڕێک ناکەون و لە لایەکی دیکەیشەوە لەگەڵ هەڵکەوتی هەلومەرجی ئێستادا ناگونجێن.

دڵسۆزتان

ڕەفیق حیلمی[9]

***

(1) نوسخەی ئەسڵیی نامەکە لە ناو ئەرشیڤی زووی (کۆڕی زانیاری کورد)دا لە بەغدا پارێزراوە، ئەمەی بەردەست وێنەیەکی کۆپیکراویەتی، بە -سپاسەوە- لە ئەوراقی کۆکراوەی بەڕێز «محەمەد مەلا کەریم» وەرگیراوە.

(2) ماجد بەگ کوڕی مستەفا کوڕی مەحمود کوڕی مورادی لەلەی کوڕانی بابانەکانە، ١٨٩٦ لە سلێمانی لەدایک بووە. مەکتەبی حەربییەی

ڕەفیق حیلمی

ئەستەموولی تەواو کردووە. بە ئەفسەری بەشداری شەڕەکانی یەکەم جەنگی جیهانی بووە و لە ١٩١٩دا گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی. لە دووەم حوکمداریی شێخ مەحموددا بەڕێوەبەری هەندەسەخانە و ئەمجا قوماندانی مەفرەزەی موحافیزی سواری و لە سێیەم حوکمداریشدا زابتی ئەمر و دوایی قوماندانی عەسکەری کوردستان بووە، تا ١٩٢٧ لە ناو جوڵانەوەکەی شێخ مەحموددا ماوەتەوە. پاشان وەزیفەی بەڕێوەبەریی ناحیەی (الموفقیە) و (العزیزیە)ی لیوای کووت و قایمقامیی (ئامێدی) و (کۆیە) و وەکیلیی موتەسەریف و موتەسەڕیفیی (مونتەفیک) و (عیمارە) و موفەتیشی ئیداریی دیون. لە یازدەیەم وەزارەتی نوری سەعید و وەزارەتی نورەددین مەحمود و شەشەم و حەوتەم وەزارەتی جەمیل مەدفەعیدا وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی و لە خولی سیازدەهەم و چواردەیەمی پەرلەمانی پاشایەتیشدا نائیبی لیوای سلێمانی بووە. ١٩٧٤/٨/٢ لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە[1].

(3) مێژووی نامەکە ١٩٤٤/٢/١٩، هیی دەورانی هەشتەم وەزارەتی نوری سەعیدە کە -وەک وترا- «ماجید مستەفا»ی تێدا وەزیری بێوەزارەت و لیبراو و ڕاسپێردراو بوو بۆ چارەسەری کێشەی کورد. ئەو دەمە هەم جوڵانەوەی بارزان، ئەم جارە بە پشتیوانی و هاوکاریی ڕاستەوخۆی حیزبی هیوا کە ناوەرۆکی کوردیی جوڵانەوەکەی دەوڵەمەند کرد و گەشەی پێدا، لە ئارادا بوو و هەم ڕۆژهەڵاتی کوردستانیش جموجوڵی سیاسیی کوردیی تێکەوتبوو و حکومەتی ئێران لەبەر هاتنەناوەوەی هێزی هاوپەیمانان، ڕووس لە باکوور و بریتانیا لە باشوور، دەسەڵاتی بەسەر بەشێکی ناوچە کوردنشینەکاندا نەمابوو. حکومەتی عێراقیش کە ساڵانێک بوو داواکانی کوردی پشتگوێ خستبوو، ناچار بوو بە تینوتاوی ئەو بارودۆخە تازەیە ئاوڕ لە مەسەلەی کورد بداتەوە و جارێکی دیکە بیر لە ڕێوشوێنی دۆزینەوەی چارەسەر بکاتەوە. تەنانەت ئەو ئاڕاستەیە لە سیاسەتی کوردیی بریتانیایشدا پەیدا بوو و ویسترا کورد لە چوارچێوەی (مامەڵەکردنێکی نوێ)دا قایل بکرێ و پەی بەو ڕاستییەیش برا کە هەردوو حکومەتی عێراق و بریتانیا هیچ گفت و بەڵێنێکیان دەرهەق بە کورد بەجێ نەهێناوە، بەڵام کۆتاییپێهاتنی جەنگ ئەو پرۆژەیەی پەکخست[2].

هەر بە کاریگەریی ئەو پێشهاتە نوێیانە بوو، کاتێک نوری سەعید لە ١٩٤٤/٤/١٩دا داوای دەستکێشانەوەی وەزارەتەکەیی پێشکەش کرد، ڕاپۆرتێکی بە ناوی (کێشەی کورد- القضية الكردية)وە خستە تەک، کە هەر بۆ خۆی و لە ناونیشانەکەیەوە بەڵگەیە کە مەسەلەیەکی فەرامۆشکراو لە عێراقدا هەیە، کاری جیددیی بۆ نەکراوە، ئەویش مەسەلەی کوردە. نوری سەعید

1 سدیق ساڵح، مەفرەزەی موحافیظی سواری لە بەڵگەنامەیەکدا، مایسی ١٩٢٣، گۆڤاری «هەزارمێرد»، سلێمانی، ژمارە ٨، کانوونی یەکەمی ٢٠٠١.

2 ستيفاني ك. ويتشارت، ((تعامل جديد)) مع الكرد: السياسة البريطانية تجاه الكرد في العراق ١٩٤١-١٩٤٥، مجلة «ژين»، السليمانية، العدد ٦، ٢٠١٤، ص٢٦٦-٢٨١.

داوای کردووە چارەسەرێکی خێرا و توند و لێزانانەی بەڕێوەبردن و ئاسایش لە ناوچەی کوردنشیندا بکرێ، بە چاککردنی بەڕێوەبردن، بایەخدان بە مەعاریف و تەندروستی و ئاوەدانکردنەوە و کاروباری دیکەی گرنگ بۆ باشترکردنی گوزەرانی خەڵک. نوری سەعید لەو ڕاپۆرتەیدا ئاماژەی بەوە داوە کە سەرخێڵ و بازرگانی کورد ئامانجی سیاسییان نییە، هەمیشە هەوڵیانە ئەمیان دەستڕۆیی و زاڵیی پشتاوپشتی خۆی و ئەویشیان بەرژەوەندییەکانی خۆی بپارێزێ. بەڵام ڕۆشنبیران کە ژمارەیان ڕووڵەزیادبوونە، ئامانجی سیاسییان سەربەخۆیی کوردستانە و داوای زۆرکردنی قوتابخانە، پەرەپێدانی پێخوێندن و زیادکردنی ئامراز و هۆیەکانی شارستانێتیی وەک ئاوەدانکردنەوە و تەندروستی و بەدەستەوەگرتنی جڵەوی بەڕێوەبردنی خۆجێییە و هەوڵی بنەبڕکردنی دەستڕۆییی سەرخێڵانیش دەدەن[3].

(4) کاتێک ماجید مستەفا لە هەشتەم وەزارەتی نوری سەعید (١٩٤٣/١٢/٢٥-١٩٤٤/٦/٣)دا وەزیری بێوەزارەت بوو، ئەرکی چارەسەری کێشەی کوردی پێ سپێردرا. ئەویش کەوتە پێوەندیگرتن و هەوڵدان بۆ کۆکردنەوە و زانینی بۆچوونی بەتایبەت ڕۆشنبیران و سەرانی خوێندەواری کورد، لە کاتێکدا خۆیشی ساڵانێک پێشتر هەڵسووڕاوێکی چالاکی ناو جوڵانەوە چەکدارییەکەی شێخ مەحمود بوو و کە وەزیفەی حکومەتیشی وەرگرت، لە نزیکەوە ئاگاداری مەسەلەی کورد بوو. بەو پێیە، یەکێک لەوانە کە داوای لێکردووە بۆچوونی خۆی بۆ چارەسەری کێشەی کورد بۆ بنووسێ، «ڕەفیق حیلمی» بوو، کە ئەو دەمە سەرۆکی حیزبی هیوا و هاوکات وەزیفەدارێکی حکومەتیش بوو. «فوئاد عارف»ی خوشکەزای ماجید مستەفا، کە ئەوسا ئەفسەری سپا و ئەندامی حیزبی هیوایش بووە، گێڕاویەتیەوە کە: (هەروەکوو من ئەیزانم تەنها کاغەزێک کە لە ناوەندە پارتی هیوادا لە چلەکاندا باسی لێوە کرابێ، نامەیە بووە کە خالّم «ماجد مصطفی» بۆ ژمارەیەک لە پیاوانی کوردی سەربەخۆ ناردوویە، لەوانەی کە نائیب و ڕئیس ئێل و ڕۆشنبیر بوون، هەروا بۆ سەرۆکی پارت ڕفیق حیلمی لەو وەختەدا کە شەڕی دووەمی گێتیی جاردرا. خالّم ماجد لەو نامەیەدا داوای ئەکرد لەو کەسانە بیروباوەڕی خۆیان دەربارەی دواڕۆژی کوردستان نیشان بدەن، کە چارەنووسی کورد لەپاش شەڕ لەبەر شەوقی ئێستی هاوسوێنان دەبێ وەکو ئەو گەلانەی کە هاوبەشی دەکەن لە شەڕدا دژی دەوڵەتانی محوەر. سەرۆکی پارت

3 عبدالرزاق الحسني، تأريخ الوزارات العراقية، المجلد الثالث – الجزء السادس، ط ٥، بيروت، ١٩٧٨، ص١٩٢-١٩٧.

وەڵامی ئەو کاغەزەی ماجدی دایەوە و بیروباوەڕی خۆی دەربارەی باسەکە نیشان دا و ڕوونووسێکی وەڵامەکەی خۆی نارد بۆ بلاط و نوری سعید)[4].

هەر بەپێی ئەو گێڕانەوەیە، ڕەفیق حیلمی نیگەران بووە کە وێنەی نامەکەی دراوەتە لایەنە ڕەسمییەکان. زۆربەی ئەفسەرانی (هیوا)یش لەوە نیگەران بوون کە پرسیان پێنەکراوە و لێی بێئاگا بوون. «ڕەفیق حیلمی» پاساوی بەوە داوەتەوە کە نامەکەی تایبەت بووە، نەک حیزبی و بۆچوونی خەڵکی کوردی تێدا ڕوون کردووەتەوە.

(5) «محەمەدئەمین زەکی بەگ» لە ١٩٣٠/١/٢٠دا عەریزەیەکی بایەخداری داوە بە مەلیک فەیسەڵی یەکەم و وێنەیەکیشی لێ داوەتە مەندووبی سامیی ئینگلیز سەبارەت بە مەسەلەی کورد و چۆنایەتیی چارەسەرکردنی. لە ١٩٣١/٥/٢٠یشدا لەسەر (قانوونی لوغاتی مەحەللی)ی نووسیوە و داویە بە حکومەتی عێراق. ئەم دوو عەریزە گرنگەی لە

4 فواد حمەخورشید، هەندێ تێبینی دەربارەی پارتی هیوا و چوونەناو باسەکە و پرسیار لە ئەندامان، گۆڤاری «ڕەنگین»، بەغدا، ژمارە ٨٨، ١٩٩٦، ل٦-١٠.

١٩٣٤دا بە ناونیشانی (دوو تەقەللای بێسوود) ەوە داوەتە (نەشرییاتی کوردی-مەریوانی) تا وەک لەچاپدراوێکی خۆی بڵاوی بکاتەوە، بەڵام حکومەت ڕێی نەداوە بڵاو ببێتەوە. «ئەدمۆندز»ی کاربەدەستێکی ئەوسای ئینگلیز نوسخەیەکی لێ هەڵگرتووە و بردوویەتیەوە بۆ لەندەن. ئەم ساڵانەی دوایی بەڕێز «صەباحی غالب» لەناو کۆکراوەی ئەدمۆندزدا لە (کتێبخانەی سواس) دۆزییەوە و ساڵی ١٩٨٤ بە لێکۆڵینەوەیەکەوە لە لەندەن لە چاپی دایەوە. (بنکەی ژین)یش ساڵی ٢٠٠٥ جارێکی دیکە لە چوارچێوەی لەچاپدانەوەی (سەرجەمی بەرهەمی محەمەدئەمین زەکی بەگ)دا لە یەکەم بەرگیدا بڵاوی کردەوە.

شایانی باسە، عەریزەی یەکەمیان لە ڕووی نیشاندانی بیری سیاسیی محەمەدئەمین زەکی بەگەوە یەکجار گرنگە، چونکە ئەو زاتە بێچەندوچۆن مەلیک فەیسەڵی لە ترسناکیی ئەو سیاسەتە کە حکومەت بەرامبەر بە کورد گرتوویەتیە بەر، بەهۆش هێناوەتەوە و پێشبینیی کردووە کە سیاسەتی وا عێراق بەرەو نەهامەتی و ماڵوێرانی دەبا. بۆیە -بە بۆچوونی ئەو- (هیچ وەختێک کورد عەرەب نییە و لەوەندەی کە ئیسکۆچی بووە ئینگلیز، ئەویش زیاتر نابێ بە عەرەب و بە ئیجبارکردنی بۆ ئیستیعمالکردنی زمانی عەرەبی وەیا عادەتی عەرەبی قەت نابێتە وەتەنییەکی صادیق بۆ عێراق. خوڵاصە، نابێ هەوڵ بدرێ کە بکرێ بە عەرەبێکی تەواو، بەڵکو ئەبێ هەموو تەشویقات و تەسهیلاتێکی بۆ بکرێ تا ببێتە کوردێکی تەواو و لەسەر ئەو نەوعە مەئموورانە لازم بوو چاک بیزانن کە گوێنەدانیان بەم نەسیحەتە بەقیمەتە و لادانیان لەم تەصریحاتە کە لە حەقائیقی تەئریخیی تازە وەرگیراوە، ئەبێ بە سەبەبی حصوولی شەک و شوبهە لە صەداقەتی حەقیقییەیان بۆ عێراق و ئەیانخاتە ژێر توهمەتی هەوڵدان بۆ هێنانەوجوودی مەسائیلی تەفرەقە و

تێکدانی وەحدەتی عێراقی)[5].

(6) «عەلی کەمال بەگ»، جگە لەوە کە خێرخوازێکی گەورە بووە، نائیبێکی چالاکی پەرلەمانیش بووە و چەندین جار ڕاشکاوانە و ئازایانە هەڵوێستی خۆی نواندووە و داکۆکیی لە مافەکانی کورد کردووە[6].

(7) «جەمال بەگی بابان»، ئەوی لێی زانراوە، پێشتر یەکەم گۆڤاری کوردی-تورکیی لەو سنوورەدا کە دوایی بە عێراق ناسرا، بە ناوی «بانگی کورد»ەوە لە بەغدا دەرکردووە و ئەندامی یەکەم دەستەی بەڕێوەبردنی (جەمعییەتی زانستی کوردان) بووە، دوایی لەبەر ئەوە لێی جیا بووەوە کە ڕێگریی لێکرا ئەو جەمعییەتە بە ئاقارێکی سیاسیدا ببا. لە ١٩٢٩یشدا کە نائیب ووە، لەگەڵ چوار ئەندامی دیکەی پەرلەماندا یادداشتێکی پێنج خاڵییان لەبارەی هەنگاوەکانی چارەسەری کێشەی کوردەوە داوەتە سەرۆوەزیران و مەندووبی سامی[7].

(8) وەک دەبینرێ، ڕەفیق حیلمی لایەنگری دووەم بۆچوون بووە بۆ چارەسەری مەسەلەی کورد لە عێراقدا. جگە لەو، بەشێکی دیاری پێشەنگانی وەچەی یەکەمی ڕۆشنبیران و خوێندەوارانی ساڵانی بیستی سەدەی ڕابوردوو بەدواوەی کوردستان، هەر ئەم ڕێبازی لاشەڕی و قۆناغ بە قۆناغ و بە شێنەیی گەشەپێدان و پێشخستنی کوردەوارییان هەڵبژاردبوو، بە ڕەچاوکردنی گەلێک ڕاستیی وەک ئەوە کە: ناوچەکە تازە لە نەهامەتییەکانی یەکەم جەنگی جیهانی ڕزگار بووە و باری ئابووری داتەپیوە؛ زۆری لاو و پیاوانی بوونەتە پێخۆری شەڕ، یا کوژراو و بریندار بوون، یان بە دیل گیراون و پەڕاگەندەن؛ برسێتی و هەژاری باڵیان بەسەر گوزەرانی خەڵکدا کێشاوە؛ زۆربەی هەرەزۆری خەڵک نەخوێندەوار و بێئاگان لە دنیا و ئامادەگیی خۆیی بۆ پرۆژەی گەورە -وەکو پێویست- لە ئارادا نییە؛ کورد لە دارشتنەوەی نەخشەی سیاسیی ناوچەکەدا پاش جەنگی گەورە، نە پشتیوانی هەبوو و نە هیچی پێبڕا؛ جوڵانەوەی چەکداریش لە حاڵوبارێکی وەهادا ناتوانێ لانی کەمی مافەکانی کورد بەدی بێنێ. بۆیە ئەوانە هەموو کار و چالاکییەکیان لە بنیاتنانی ژێرخانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریدا چڕ کردەوە، ئەویش بە هەوڵدان بۆ کردنەوەی قوتابخانەی زۆرتر، پێگەیاندنی مامۆستای زۆرتر، پچڕینی خوێندنی بەرز بۆ قوتابیی کورد لە دەرەوە، بڵاوکردنەوەی خوێندەواری، پەرەدان بە ڕێگەوبان، بایەخدان بە کشتوکاڵ و پیشەسازی و هۆشیارکردنەوەی خەڵک لە ڕێی ڕۆژنامەگەری و خوێندن و -دواییش لە ناچاریدا- ڕێکخستنی نهێنییەوە. ئەوانە، وەک دوایی دەرکەوت، توانییان لەو ڕێیەوە خزمەتێکی گەورە و بەرچاوی کوردەواری بکەن.

(9) ڕەفیق حیلمی کوڕی ساڵح ئەفەندیی کەرکووکیی کوڕی مارف ئاغای عەزیز ئاغای بابەکر ئاغای مەلا وەیسییە، ١٨٩٨ لە کەرکووک لەدایک بووە. قوتابخانەی ئەندازەی بەرزی لە ئەستەمووڵ خوێندووە. ئەندامی کۆمەڵەی (هێڤی) و ئەندامی دامەزرێنی (کۆمەڵی سەربەخۆیی کوردستان) و ئەندامی هەڵبژێردراوی (جەمعییەتی کوردستان) و سەرۆکی حیزبی (هیوا) و پاشتریش ئەندامی چەند کۆمەڵەیەکی ڕۆشنبیری

---

5 سەرجەمی بەرهەمی محەمەدئەمین زەکی بەگ، بەرگی یەکەم، ئامادەکردنی سدیق ساڵح، بنکەی ژین- سلێمانی، ٢٠٠٥، ل٤٧-٤٨.

6 لەو بارەیەوە بڕوانە: مذكرات علي كمال عبدالرحمن، تقديم وتحقيق: جمال بابان، بغداد، ٢٠١، ص٣٣-٤٧، ٢٠٥-٢١٧.

7 ڕۆژنامەی (ژیان)، ژمارە ١٦٦، ١٩٢٩/٤/١١- ڕۆژنامەی ژیان، دووەم بەرگ (ژمارە ٨١-٢٥٩)، ئامادەکردنی ڕەفیق ساڵح و سدیق ساڵح، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٣.

و کۆمەڵایەتی بووە. مامۆستایی لە: کەرکووک و سلێمانی و عیمارە و هەولێر و ناسریە و موسڵ و بەغدا و بەعقوبە و بەسرە کردووە و بە پلەی موفەتیشی مەعاریف گەییوە. لە سەردەمی کۆماریدا بەڕێوەبەری ئەمانەتی پایتەخت و پاشکۆی ڕۆشنبیریی باڵوێزخانەی عێراق بووە لە تورکیا. ١٩٦٠/٨/٤ بە خوێنپژانی مێشک کۆچی دوایی کردووە. (١٠) کتێب و نامیلکە و چەندین وتار و نووسینی بڵاوکراوەی هەن[٨].

8 ڕۆژنامەکانی سەردەمی حوکمی شێخ مەحمود، ئامادەکردنی ڕەفیق ساڵح و سدیق ساڵح، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل١٢-١٣.

# ڕەفیق حیلمی- بیبلیۆگرافیا و پێڕستی لە کتێبی کوردیدا ١٩٣٤- ٢٠١٠

**بوار نوورەدین**

Bwar_n@yahoo.com

ئەو پرۆژەیەی ئەم بیبلیۆگرافیا تایبەتەی لێ ئامادە کراوە، ٥٦٨٠ کتێبی تێدا ناسێنراوە و لە ٥٢٠٠ لاپەڕە پێک هاتووە و بەسەر ١٢ بەرگ و بەشدا دابەش کراون، تایبەت کراوە بەو کتێبانەی لە نێوان سالآنی ١٩٢٠-٢٠١٠دا، لەبارەی (کورد و کوردستان)ەوە نووسراون، کتێبی نووسراوی بە هیچ زمانێکی تر لەخۆ نەگرتووە.

بێ هیچ گومان و چەندوچوونێک، هێشتا کەموکورتی هەیە، ئەمەش سروشتێکی ئامادەکردنی بیبلیۆگرافیایە، بە تایبەت لە ولآتێکی وەک کوردستان و لە پێناوی کتێبی کوردیدا. لەم پرۆژەیەدا، هەوڵی دروستکردنی شێوازێکی تایبەت دراوە لە ئامادەکردنی بیبلیۆگرافیادا، ئەویش سەرەڕای ئەو شێوازانەی پێشتر لە ئامادەکردنی بیبلیۆگرافیای کتێبی کوردیدا بەکار هاتوون، بایەخ بە (ناوەرۆک)ی کتێبەکانیش دراوە و وەک ئامانجێکی سەرەکی لەبەرچاو گیراوە.

پێش تەواوبوونی پرۆژەکە، توانراوە چەند بەرهەمێکی لێ بڵاو بکرێتەوە، کە هەندێکیان وەک کتێبی سەربەخۆ چاپ کراون، هەروەها لە ژمارەکانی کۆتایی (ڕۆڤار)دا، کە (دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم) دەری دەکات، بیبلیۆگرافیای تایبەت بە چەند کەسایەتییەکی تر ئامادە کراوە. لەم بیبلیۆگرافیایەدا،

کتێبەکان بەپێی ساڵ و لە هەر ساڵێکیشدا، بەپێی (تیپ)ـە کوردییەکان ڕیز کراون. بە پێویستمان نەزانی هەموو ئەو سەرنج و تێبینییانە بنووسینەوە، کە لە ئامادەکردنی بیبلیۆگرافیاکانی پێشتردا ئاماژەمان پێکردوون، لە پێناوی زانیاریی زۆرتر لەبارەی پرۆژەکە و شێوازی بیبلیۆگرافیاکە، خوێنەر دەتوانێ بگەڕێتەوە بۆ: بیبلیۆگرافیای کتێبی کوردی- بەرگی یەکەم: مێژوو و جوگرافیا، بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، هەولێر، چ (حاجی هاشم)، ٢٠١٤.

هێما بەکارهاتووەکان

چاپ: نۆرەی چاپە واتە چاپی یەکەم و دووەم

چ: چاپخانە

ش: شوێن

و- وەزارەت

ژس: ژمارەی سپاردن

س: ساڵ

ل: لاپەڕە

ق: قەوارە (بە سانتیمەترە و "پانی"ی پێش "درێژی"ی نووسراوە)

؟: بۆ هەر زانیارییەکی نەزانراو و نادیار دانراوە

تێبینی: لەم بیبلیۆگرافیایەدا، ناونیشانی کتێبەکانیش بە (ڕێنووس)ی ئێستا نووسراونەتەوە.

یەکەم بیبلیۆگرافیا:

کتێبەکانی ڕەفیق حیلمی ١٩٣٤- ٢٠١٠

١. خولاسەی مەسئەلەی کورد

نووسین: نادیار؟

وەرگێڕانی لە زمانی فڕەنسییەوە: ڕەفیق حیلمی

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: مووسڵ، ژس: ؟، س: ١٩٣٤، ل:٣٢، ق:١٥×٢٢

ناوەرۆک:

موقەدیمە/ مەسەلەی کورد- موناسەباتی لەگەڵ عێراق- قیامی شێخ مەحموود.

تێبینی یەکەم: هەروەها نووسراوە: لە کتێبی عێراق و عوسبەتولئومەم (L, IRAQ et la societe desnations) ترجمە کراوە.

تێبینی دووەم: بۆ ناوی نووسەر، بە ناو کتێبەکەدا، زۆر گەڕام و نەمتوانی ساغی بکەمەوە؟

تێبینی سێیەم: تەنیا نووسراوە (ڕەفیق حیلمی)، لە کاتێکدا ئەم کتێبەی لە زمانی فڕەنسییەوە وەرگێڕاوە؟ بڕوانە: ڕۆژنامەکانی سەردەمی حوکمی شێخ مەحموود، ئامادەکردن: ڕەفیق ساڵح، لێکۆڵینەوە: سدیق ساڵح، بڵاوکراوەی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان- سلێمانی، چ(تیشک)، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل١٣.

٢. نامیلکەی کومەڵایەتی

نووسین: زیائ گوک ئالپ بەگ

وەرگێڕانی لە زمانی تورکییەوە: ڕەفیق حیلمی

چاپ: یەکەم، چ: دیجلە، ش: مووسڵ، ژس: ؟، س: ١٩٣٤، ل:٢١، ق:١٤×٢٠

ناوەرۆک:

ئیجتیماعییات- میللەت چییە؟/ ئەخلاقی ئیجتیماعییانە؟

٣.  سەرەتای عیلمی ژمارە- بەرگی دووەم

نووسین: ڕەفیق حیلمی (مامۆستای ڕیازییات لە قوتابخانەی ناوەندی ڕۆژئاوا لە بەغدا)

چاپ: یەکەم، چ: فەنییە، ش: بەغدا، ژس: ؟، س: ١٩٣٦، ل:٦٥، ق:١٥×٢٢

ناوەڕۆک:

لاپەڕەی هەڵەکان/ ئەو ماددانەی کە لەم کتێبەدایە (ناوەڕۆک)/ جەزری موکەعەب- تەعریف/ وەرگرتنی جەزری موکەعەب/ نیسبەت/ خەواسی نیسبەت/ تەناسووب/ خواسی تەناسوب/ مەبسووت و مەعکووس/ مەسئەلەی تەناسووبی بەسیت/ هەندێ مەسەلەی تواوە/ مەسئەلەی تەناسووبی تێکەڵ/ تەقسیمی موتەناسیب/ شیرکەت/ سوئالەکانی وەزارەتی مەعاریف لە ساڵی ١٩٢٢- ١٩٢٨.

تێبینی: لە پرۆژەی بیبلیۆگرافیاکەدا، ئەو کتێبانەمان تۆمار نەکردووە کە بە شێوەیەکی تایبەت بۆ (پرۆسەی خوێندن) نووسراون... لەم کارە تایبەتەدا پێمان باش بوو ئەم کتێبەش تۆمار بکەین.

٤.  شیعر و ئەدەبیاتی کوردی- بەرگی یەکەم

نووسین: ڕەفیق حیلمی

چاپ: یەکەم، چ: تەفیز، ش: بەغدا، ژس: ؟، س: ١٩٤١، ل:١٤٦، ق:١٤×٢١

ناوەڕۆک:

دیاری (پێشەکی)/ وێنە و چەند نموونە شیعرێک و کورتەیەک لە ژیانی کۆمەڵێک شاعیری کورد، وەک: ئەحمەد بەگی فەتاح بەگ/ ئەحمەد بەگی وەسمان پاشا (ئەحمەد موختار جاف)/ ئەمین فەیزی بەگ/ ئەمین زەکی بەگی عەسکەر و موئەریخ/ ئەسیری/ ئاهی/ بێخود/ بێکەس/ پیرەمێرد-ئوستادی شیعر و ئەدەب/ حاجی قادری کۆیی-بولبولی نیشتمانپەروەری کورد/ حەریق-مەلا ساڵح/ حەمدی-مەلا حەمدوون/ خاکی/ خەستە.

تێبینی: لەسەر بەرگ نەنووسراوە (بەرگی یەکەم) و بە پێی دوا لاپەڕە دانراوە.

٥.  بەرگی دووەمی شیعر و ئەدەبیاتی کوردی- باس ئەم بویژانەی کورد و شیعرەکانیان

ڕەفیق حیلمی

مترجم: رفیق حلمی

ژمارە — ١

نامیلکەی کومەلایەتي

نوسینی زانای گەورەی کورد

مرحوم

ضیاء گوك آلپ بك

« ماموستای پیشوی علومی اجتماعیە لە دار الفنون استە موڵ »

موصل

لە چاپخانەی دجلە لە چاپ دراوە

١٩٣٤

نرخي ١٠ فلسە

بخوێنەوە: دڵدار- ڕەمزی (سالم) سەلام- عەلی باپیر ئاغا-گۆران- نووری شێخ ساڵح

نووسین: ڕەفیق حیلمی

چاپ: یەکەم، چ: الشباب، ش: بەغدا، ژس: ؟، س: ١٩٥٦، ل:٢٠٨، ق:١٧×٢٣

ناوەڕۆک:

پێشکەش/ سەرەتا/ دڵدار (یونس ڕەئووف ١٩١٧-١٩٤٨)/ مندالَی هیوا/ ڕەمزی (مەلا مارف)/ وێنەی شیعری ڕەمزی و ئوسلوبی/ سەرزەنش/ زێوەر (مەلا عەبدوڵلا)/ سالم (ئەوڕەحمان بەگ)/ غەرامیاتی سالم/ سالم و عەزیز بەگی بابان/ سەلام/ کورد/ شیوەن/ سەلام و ڕوباعییەکانی خەیام/ عەلی باپیر ئاغا/ شیعری عەلی باپیر ئاغا و شێوەی شیعر دانانی/ گۆران (عەبدوڵلا بەگ)/ نووسراوەکانی گۆران/ گوڵی خوێنین/ لە درزی پەچەوە/ دیمەنی ڕێگاوبان/ ڕێگای ناو باخ/ مەلای دیوەخان/ بەیان/ مزگەوت/ کانی ژنان/ ژن/ گۆرانی/ جیلوەی شانۆ/ نووری (شێخ نووری شێخ ساڵح)/ ژیانی ئادەمیزاد/ پەپوولە.

٦. یادداشت- بەرگی یەکەم- بەشی ١/ کوردستانی عێراق و شۆڕشەکانی شێخ مەحموود

نووسین: ڕەفیق حیلمی

چاپ: یەکەم، چ: مەعاریف، ش: بەغدا، ژس: ؟، س: ١٩٥٦، ل:١٠٠، ق:١٥×٢٢

ناوەڕۆک:

سەرەتا/ مستەفا کەمال لە (ئەنادۆڵ)/ وەزارەتی (فەرید پاشای زاوا) و مستەفا کەمال/ کوردستانی جنوب لە دوا ڕۆژەکانی شەڕی گێتیی یەکەمدا/ نەتەوەی شێخ مەحموود و چەشنی ژیانی/ فیتنەی مووسڵ و کوژرانی شێخ سەعیدی حەفید و شێخ ئەحمەدی کوڕی/ گەڕانەوەی شێخ مەحموود بۆ سلێمانی/ دوای گەڕانەوەی شێخ مەحموود بۆ سلێمانی/ شەڕی گەورەی گێتیی یەکەم و شێخ مەحموود/ هاتنەوەی ئینگلیزەکان بۆ کەرکووک/ هاتنی مێجەر نوئێل بۆ سلێمانی/ حوکمداری کوردستان/ شێخ مەحموود و کۆنفڕانسی ئاشتی/ لە دەوری یەکەمی حوکمداری شێخ مەحموودا هەواڵی سلێمانی/ گەشتی مێجەر نوئێل و فائیقی تاپۆ لە تورکیا/ سلێمانی دوای ڕۆیشتنی مێجەر نوئێل/ سەفەری من بۆ کۆیە لەگەڵ (کەپتەن بیل)/ شکاندنی نفووزی شێخ مەحموود لە ناو عەشایردا/ شێخ ئەمینی سندۆڵان/ وێنەی چەند کەسایەتییەک لە ناو کتێبەکەدا هەیە.

٧. یادداشت- بەرگی یەکەم- بەشی ٢/ کوردستانی عێراق و شۆڕشەکانی شێخ مەحموود

نووسین: ڕەفیق حیلمی

چاپ: یەکەم، چ: مەعاریف، ش: بەغدا، ژس: ؟، س: ١٩٥٦، ل:١٠١-٢١٠، ق:١٥×٢١

ناوەرۆک:

سەرەتای بەشی دووەم/ وێنەیەکی تر لە کردەوەکانی ئینگلیز بۆ شکاندنی نفووزی شێخ مەحموود/ دەرکەوتنی سەرەتای شۆڕشی شێخ مەحموود/ چوونی من بۆ ڕواندز لەگەڵ (بیل)/ شۆڕشی یەکەمی شێخ مەحموود و ئەنجامی/ لە کاتی شەڕی دەربەندیدا هەواڵی ڕواندز/ دوای ڕۆیشتنی (بیل) بۆ هەولێر من و ڕواندز/ گیرانم لە ڕواندز و ڕەوانەکرانم بۆ بەندینخانەی کۆیە/ عەبدوڵڵا ئاغای حاجی تایەر ئاغای عەوێزی/ بەربوونم لە بەندینخانە/ مەحکەمەی شێخ مەحموود لە بەغدا/ لەشکری بۆتان تاو ئەداتە سەر خاکی تورک/ کەوتنی وەزارەتی (وەنیزەلۆس)/ ئەنجامی تەقەلای بەکر سامی و ڕێککەوتنی لەگەڵ فرەنسا و ئیتاڵیا/ باسی مەسەلەی کورد لە ئەستەمبوڵ/ مستەفا کەمال و کوردەکان/ هەندێ هۆی تایبەتی سەرکەوتنی مستەفا کەمال/ چەند وێنەیەک/ ناوئاخن.

٨. یادداشت بەرگی دووەم بەشی -١- کوردستانی عێراق و شۆڕشەکانی شێخ مەحموود

نووسین: ڕەفیق حیلمی

چاپ: یەکەم، چ: مەعاریف، ش: بەغدا، ژس: ؟، س: ١٩٥٦، ل:١٠٧، ق:١٥×٢١

ناوەرۆک:

سەرەتا/ دوایین شەڕی تورک و یۆنان/ دوای ڕەوانەکردنی (شێخ مەحموود) بۆ هیندستان/ شۆڕشی کوردەکانی عێراق لە عەمادیە و عەقرە/ هاتنی (ئۆزدەمیر پاشا) بۆ ڕواندز/ (مێجەر سۆن) و ئێمە/ سەید تەهای شەمدینان و مەسەلەی کورد/ لەسەر نەگرتنی مەسەلەی کورددا کوردەکان خۆیان بەشدارن/ عێراق لە ژێر ئینتیدابدا/ بە کورتی باسی شۆڕشەکانی کورد و عەرەب لە عێراق لە ساڵی ١٩٢٠/ شۆڕشی گەورەی عەرەبەکانی عێراق/ (حەمدی بەگ)ی بابان/ ئەنجامی شۆڕشی (مستەفا کەماڵ) لە تورکیا/ تورکەکان و ولایەتی مووسڵ و (کۆمەڵەی ئێمە و حەمدی بەگ)/ ناوەرۆک.

٩. یادداشت بەرگی دووەم بەشی ٢ جزمی چوارەم/عێراق و شۆڕشەکانی شێخ مەحموود

ڕەفیق حیلمی

نووسین: ڕەفیق حیلمی

چاپ: یەکەم، چ: مەعاریف، ش: بەغدا، ژس: ؟، س: ١٩٥٦، ل:١٠٩-٢١٠، ق:١٥×٢٢

ناوەڕۆک:

وێنەی شێخ سەعید (زەعیم)ی شۆڕشی کورد لە تورکیا/ سەرەتا/ نامەی کراوە بۆ هەندێ لە (ڕەغنە = ڕەخنە)گرە بەڕێزەکان/ کۆبوونەوەمان لە ماڵی (عەزمی بەگی بابان)/ لێرەوە بابەتەکان ژمارە و ناونیشانیان بۆ دانراوە (٥٣ تا ٦٥) چەند بابەتێکیش تەنیا ژمارەیان بەسەرەوەیە: هاتنی (حەمدی بەگ) بۆ سلێمانی/ شەڕی کورد و ئینگلیز لە (دەربەندی ڕانیە)/ ئەنجامی کۆمەڵەی سەربەخۆیی/ (تەلگراف) ێک لە کەرکووکەوە، ئەوەندەی نەمابوو ببم بە وەکیلی (ئەحمەد ئاغا) دواجار بە کاتبی/ لە کەرکوک کرام بە مامۆستای قوتابخانەی (زەفەر)/ ڕۆژنامەی نەجمە/ بە هەڵە چووبووم/ لاپەڕەیەکی تر لە شۆڕشی عەرەبەکانی عێراق/ دەزگاکانی سیاسیی ئینگلیز لە عێراقا/ ئەنجامی شۆڕشی عێراق، فەیسەڵ لە سووریە، هاتنی بۆ عێراق/ بوونی بە مەلیک، مەسەلەی کورد/ (ئەمیر فەیسەڵ) کرا بە مەلیکی سووریا/ تورکەکان لە موئتەمەرەکانا چۆن سەرکەوتن؟

١٠. یادداشت- جزمی پێنجەم- کوردستانی عێراق و شۆڕشەکانی شێخ مەحموود

نووسین: ڕەفیق حیلمی

چاپ: یەکەم، چ: مەعاریف، ش: بەغدا، ژس: ؟، س: ١٩٥٧، ل:٤٢١-٥٣٣، ق:١٥×٢١

ناوەڕۆک:

تکایەک و ڕاستکردنەوەیەکی بچووک/ وەزارەتی یەکەمی (سەید ئەوڕەحمانی نەقیب) و مەسەلەی کورد/ لە بەینی حکوومەتی عێراق و (مەندووبی سامی)دا ئاڵوگۆڕی نامە و باسی مەسەلەی کورد/ وەڵامی سکرتێری (مەندووبی سامی)/ (سەید محەممەد سەدر) دوایی کرا بە ڕەئیسی وەزارەت و لەپێش مردنیدا ڕەئیسی ئەعیان بوو/ پەیمانی عێراق و بەریتانیا/ مەجلیسی دامەزرێنەر چۆن کۆکرایەوە؟/ موئتەمەری ئاشتی و مەسەلەی کورد/ ئینگلیز و عەرەب/ مەلیک حسێن/ جەمعیەتی کوردستان/ مستەفا پاشا و ئیسماعیل ئاغای شوکاک (سمکۆ)/ مەسەلەی مووسڵ و حکوومەتی جاری دووەمی شێخ مەحموود/ لە پێش گەڕانەوەی شێخ مەحمووددا هەواڵی سلێمانی- زەماوەندی هەڵکرانی ئاڵای کوردستان/ گەڕانەوەی شێخ مەحموود بۆ سلێمانی/ ماوەی خەڵوەتی شێخ مەحموود و دامەزراندنی هەیئەتی ڕەئیسەکان (مەجلیسی وزەرا)/ شێخ مەحموود لە بەغدا خۆی بەرامبەر بە مەلیک فەیسەڵ و مەندووبی سامی چۆن پیشان دابوو؟

١١. يادداشت/ کوردستانی عێراقو شۆڕشەکانی شێخ مەحموود- بەرگی شەشەم

نووسین: ڕەفیق حیلمی

چاپ: یەکەم، چ: مەعاریف، ش: بەغدا، ژس: ؟، س: ١٩٥٨، ل:٥٣٤-٦٣٧، ق:١٥×٢١

ناوەرۆک:

وێنەی (لوتف عەلی خان زەند) یەکێ لە هەرە ناودارە گەورەکانی کورد لە ئێران/ پێشەکی/ مەعاریفی سلێمانی/ تورکەکان چۆن هاتنە (ڕواندز)؟ و دەوری (ئەحمەد تەقی) لەم هاتنەدا/ هاتنی ئۆزدەمیر (بۆ ڕواندز)/ شێخ مەحموود چۆن فریو درا و ڕاکێشرایە ژێر باڵی ئۆزدەمیر وەیا تورک؟/ هاتنی (سمکۆ) بۆ سلێمانی/ بە کورتی هەواڵی ئۆزدەمیر و کردەوەکانی لە ڕواندز/ ئۆزدەمیر و سلێمانی/ گەڕانەوەی (شێخ مەحموود) بۆ سلێمانی و ئۆزدەمیر/ سیاسەتی ئۆزدەمیر بەرامبەر بە کورد/ تەقەلاکانی دەستەی ئۆزدەمیر لەگەڵ (شێخ مەحموود) و ڕۆژە سەختەکانی سلێمانی/ موئتەمەری سلێمانی و بڕیاردان لەسەر مەرجەکانی ئۆزدەمیر/ گفتوگۆی نهێنی دوای نیوەی شەو لە تەک (شێخ مەحموود) و سمکۆ) لە لایەن تورکەوە گفتوگۆی نهێنی (شێخ مەحموود و سمکۆ) لەگەڵ من/ تایەری ئەمین ئەفەندی مەسرەف و شێخ مەحموود/ ڕێککەوتنی کورد و تورک و داواکانی شێخ مەحموود/ خوێنەرە بەڕێزەکان.

١٢. پاش تەمووز

نووسین: ڕەفیق حیلمی

چاپ: یەکەم، چ: الرأی العام، ش: بەغدا، ژس: ؟، س: ١٩٦٠، ل:٦٣، ق:١٢×١٧

ناوەرۆک:

پێشنیارێکی سەرگورشتاوی/ پەسند: مەعرووف خەزنەدار ئەندامی یەکێتی ئەدەبیاتی عێراق/ ١٤ی تەمووز/ بۆ گیانی پاکی شێخ مەحموودی نەمر/ عەقڵ تیا کولە/ چۆن ئەڵێی کوردم؟/ داری ناکۆکی لە بندا هەڵکەندن/ بە بۆنەی شۆڕشی مەزنی ١٤ی تەموزەوە/ بە بۆنەی بیرەوەریی ساڵی یەکەمی ١٤ی تەمووزی پیرۆزەوە/ شاژن/ چاپکراوەکانی نووسەر.

١٣. شیعر و ئەدەبیاتی کوردی

نووسین: ڕەفیق حیلمی

چاپ: ؟، چ: التعلیم العالی، ش: بەغدا، ژس: ٨٠٨، س: ١٩٨٨، ل:٢١٠، ق:١٧×٢٣

ناوەرۆک:

بەرگی یەکەم: پێشەکی: پاکیزە/ دوو وشە: د.عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ/ بەرگی یەکەم (بۆ ناوەرۆکی ئەم بەرگە بڕوانە کتێبی ژمارە ٣)/ بەرگی دووەم (بۆ ناوەرۆکی ئەم بەرگە بڕوانە کتێبی ژمارە٤)/ پێڕست.

١٤. یادداشت- کوردستانی عێراقو شۆڕشەکانی شێخ مەحموود- بەشی یەکەم

نووسین: ڕەفیق حیلمی

ڕەفیق حیلمی

له بڵاوکراوەکانی ئەمینداریێتیی گشتیی ڕۆشنبیری و لاوان

چاپ: دووەم، چ: ڕۆشنبیری و لاوان، ش: هەولێر، ژس: ١٥٢٤، س: ١٩٨٨، ل:٣١٦، ق:١٦×٢٢

ناوەڕۆک:

پێشەکی: پاکیزە ڕەفیق حیلمی/ وێنەی هەمان لاپەڕەکانی چاپی یەکەمی بەرگی یەکەم تا سێیەم، بڕوانە هەر سێ کتێبی ژمارە ٥ و ٦ و ٧.

١٥. یادداشت –کوردستانی عێراقو شۆڕشەکانی شێخ مەحموود– بەشی دووەم

نووسین: ڕەفیق حیلمی

له بڵاوکراوەکانی ئەمینداریێتیی گشتیی ڕۆشنبیری و لاوان

چاپ: یەکەم، چ: ڕۆشنبیری و لاوان، ش: هەولێر، ژس: ١٥٢٤، س: ١٩٨٨، ل:٣١٦، ق:١٦×٢٢

ناوەڕۆک:

هەمان ناوەڕۆک و وێنەی لاپەڕەکانی چاپی یەکەمیان هەیە، بڕوانە هەر سێ کتێبی ژمارە ٨ و ٩ و ١٠.

١٦. یادداشت– بەشی سێیەم– کوردستانی عێراقو شۆڕشەکانی شێخ مەحموود

نووسین: ڕەفیق حیلمی

ئامادەکردن و لێکۆڵینەوە و پێداچوونەوە: پاکیزە ڕەفیق حیلمی

له بڵاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی

چاپ: یەکەم، چ: دارالحریه، ش: بەغدا، ژس: ٦١٣، س: ١٩٩٢، ل:١٧٦، ق:١٧×٢٤

ناوەڕۆک:

پێشەکی: پاکیزە ڕەفیق حیلمی/ مەسەلەی مووسڵ و کورد/ جەمعیەتی کوردستان لە سلێمانی/ هاتنی سمکۆ بۆ سلێمانی/ شاری ئەنقەرە/ شاری ورمێ/ لە (ورمێ)ەوە بۆ شەرەفخانە/ لە شەرفخانەوە بۆ شیستەر/ تەوریز/ ئەستەمبوڵ/ شاری جولفا/ تفلیس/ لاپەڕەیەک لە مێژووی قەفقاسیای کۆن/ (باگوم) باتوم/ شاری ئزمید (ئزمیر)/ گەڕانەوەم لە ئەنقەرەوە بۆ سلێمانی/ ئەدەنە/ عینتاب/ دیاربەکر/ بتلیس/ ئەخلات/ شاری وان/ تێبینی.

١٧. یادداشت

نووسین: ڕەفیق حیلمی

نوێکردنەوەی ڕێنووس و هەڵەچنی: نەورۆز حسێن

له بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپ: سێیەم، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژس: ١٧٧، س: ٢٠٠٣، ل:٤٥٩، ق:١٦×٢٢

ناوەڕۆک:

هەمان ناوەڕۆکی بەرگ و بەشی چاپەکانی پێشتری هەیە، بڕوانە کتێبەکانی ژمارە ٥–١٠/ پێڕست (هەموو بەش و بەرگەکان)/ لەسەر بەرگی دواوە، دەستخەتێکی (ڕەفیق حیلمی) دانراوە.

١٨. شیعر و ئەدەبیاتی کوردی

نووسین: ڕەفیق حیلمی

له بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

چاپ: ؟، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژس: ٢٣٠٥، س:

٢٠١٠، ل:٢٣٥، ق:١٥×٢١

ناوەرۆک:

وتەیەکی پێویست: ئاراس/ هەمان ناوەرۆکی چاپی یەکەم و دووەمی هەیە، بڕوانە هەر سێ کتێبی ژمارە ٣ و ٤ و ١٢.

تێبینی: بەرگی یەکەمی، چاپی سێیەمە و بەرگی دووەمی چاپی دووەمە و ئاماژەیان پێ نەکراوە؟

کتێبە بێ ساڵەکان

١٩. یادداشت- بەشی یەکەم/ کوردستانی عێراقو شۆڕشەکانی شێخ مەحموود

نووسین: ڕەفیق حیلمی

ئامادەکردن: پاکیزە ڕەفیق حیلمی

چاپ: ؟، چ: ؟، ش: ؟، ژس: ؟، س: ؟، ل:٣١٦، ق:١٦×٢١؟

ناوەرۆک:

پێشەکی: پاکیزە ڕەفیق حیلمی/ هەمان ناوەرۆک و وێنەی لاپەڕەی چاپی یەکەمی هەیە، بڕوانە هەر سێ کتێبی ژمارە ٥ و ٦ و ٧.

٢٠. یادداشت- بەشی دووەم/ کوردستانی عێراقو شۆڕشەکانی شێخ مەحموود

نووسین: ڕەفیق حیلمی

ئامادەکردن: پاکیزە ڕەفیق حیلمی

چاپ: ؟، چ: ؟، ش: ؟، ژس: ؟، س: ؟، ل:٣١٧، ق:١٥×٢١

ناوەرۆک:

هەمان ناوەرۆک و وێنەی لاپەڕەی چاپی یەکەمی هەیە، بڕوانە هەر سێ کتێبی ژمارە ٨ و ٩ و ١٠.

دووەم بیبلیۆگرافیا:

پێڕستی بەرهەمی ڕەفیق حیلمی

لە ناوەرۆکی کتێبی کوردیدا ٢٠٠٧- ٢٠١٠

١. گەلاوێژ- گۆڤارێکی ئەدەبی و سەقافی کوردییە- ژمارە ١- ١٢ کانونی یەکەمی ١٩٣٩تشرینی دووەمی ١٩٤٠

ئامادەکردن و بڵاوکردنەوە: ڕێکخراوی ئیبراهیم ئەحمەد- پڕۆژەی چاپکردنەوەی گۆڤاری گەلاوێژ ١

چاپ: ؟، چ: کارۆ، ش: سلێمانی، ژس: ؟، س: ٢٠٠٧، ل: ٦٦٦، ق:١٧×٢٢

ناوەرۆک:

ژ١ س١: کورد لای بێگانە- ئەهلی سەلیب دێنە کوردستانەوە- و: ڕەفیق حیلمی (بۆ ژمارەکانی تر درێژەی هەیە).

تێبینیی یەکەم: لەسەر کتێبەکە نووسراوە: خاوەن ئیمتیاز و سەرنووسین: ئیبراهیم ئەحمەد/ بەڕێوەبەری نووسین و سەرپەرشتیاری چاپ: عەلادین سەجادی.

تێبینیی دووەم: لە ناسنامەدا نووسراوە چاپی

دووەم؟ واتە چاپی گۆڤارەکە بە چاپی یەکەم دانراوە؟

٢.	چی لەبارەی محەمەدئەمین زەکی بەگەوە نووسراوە

ئامادەکردن: ڕەفیق ساڵح

لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ژین

چاپ: یەکەم، چ: شڤان، ش: سلێمانی، ژس: ١٩٩٠، س: ٢٠٠٩، ل:٤٥٠، ق:١٧×٢٤

ناوەرۆک:

ڕەفیق حیلمی: ئەمین زەکی بەگ عەسکەر و موئەریخ.

٣.	ڕۆژنامەوانیی کوردی- گۆڤاری هیوا ١٩٥٧- ١٩٦٣ بەرگی سێیەم

لێکۆڵینەوە و ئامادەکردن: د. هیمداد حسێن

لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

چاپ: یەکەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژس: ٧٥٥، س: ٢٠١٠، ل:٦٨٤، ق:١٧×٢٣

ناوەرۆک:

ژ٢ی س٢ ١٩٥٨: بەبۆنەی شۆڕشی مەزنەوە: ڕەفیق حیلمی.

سێیەم بیبلیۆگرافیا:

کتێبی سەربەخۆ لەبارەی (ڕەفیق حیلمی)

لە کتێبی کوردیدا ٢٠٠٥-٢٠٠٧

١.	بەسەرهاتی ڕەفیق حیلمی

نووسین و ئامادەکردن: ناهیدە (پاکیزە) ڕەفیق حیلمی

پێداچوونەوە: کەژاڵ ئەحمەد

لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

چاپ: یەکەم، چ: ڕوون، ش: سلێمانی، ژس: ٤٢١، س: ٢٠٠٥، ل:٢٧٤، ق:١٦×٢٢

ناوەرۆک:

بەشی یەکەم: چۆن خانوومان کرد تا لە کرێچیەتی دەربچین؟/ لە بەغدا/ جەنگی (ڕەشید عالی گەیلانی)/ دەفتەری سێیەم/ بوو بە موفەتیشی مەعاریفی کەرکووک و سلێمانی/ چۆنیەتیی گواستنەوەی لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر/ بەڕێوەبەری بەڕێوەبەرایەتیی پەروەردە لە دیالە/ لە عەممارە (میسان)/ سەرگوزشتەی هەڵبژاردنی/ نموونەی یادنامەکانی ڕۆژانەی/ بەغدا پێش شۆڕشی تەمووز ١٩٥٢- ١٩٥٨/ هێرشی سێ قۆڵی بۆ سەر میسر/ لە کوەیت لەگەڵ وەفدی یەکێتیی ئەدیبانی عێراق/ پاش شۆڕشی تەمووز و پێش کۆچی دوایی/ جەمیلە خانی هاوسەری ڕەفیق حیلمی/ دایکم و باوکم ئێمەیان بەجێهێشت/ چالاکییەکانی ڕەفیق حیلمی لە کاری میریدا/ ژیانی سیاسیی ڕەفیق حیلمی/ قۆناغی یەکەم/ لاوێتی و شیعری دڵداریی/ قۆناغی دووەم/ خەباتی شیعری سیاسی/ قۆناغی سێیەم/ سەردەمی شێخی نەمر و خەباتی نەتەوەیی/ ژیانی سیاسیی ڕەفیق حیلمی/ ئاشنابوونی بە شێخ مەحموودی نەمر/ شێخ مەحموود پێش حوکمدارێتی/ بەشی دووەم: چۆنیەتیی دامەزراندنی حوکمدارێتی یەکەمی شێخ/ پەیوەندیی ڕەفیق حیلمی بە ئینگلیزەوە/ سەرەتای شۆڕشی شێخ/ گیرانی ڕەفیق حیلمی/ بەربوونی لە بەندینخانە/ سلێمانی پێش شکانی شێخ/

مەجلیسی ئیدارەی هەرێمی سلێمانی/ بەرەو بەغدا/ ڕەفیق حیلمی و حەمدی بەگی بابان و کۆمەڵەی سەربەخۆیی کورد/ ویستویەتی قیرائەتخانە بکاتەوە/ مامۆستای قوتابخانەی زەفر لە کەرکووک/ کورتە باسێکی هەرێمی سلێمانی پێش گەڕانەوەی شێخ لە هیندستان/ کۆمەڵەی کوردستان/ جەمعییەتی کوردستان/ گەڕانەوەی شێخ بۆ سلێمانی/ کارەکانی لە سەردەمی حوکمی دووەمی شێخدا/ ڕۆژی هاتنی سمکۆ بۆ سلێمانی/ بەشی دووەم- قۆناغی چوارەم/ ڕەفیق حیلمی نوێنەری شێخ مەحموود لە ئەنقەرە/ گفتوگۆی نهێنی پاش نیوەشەو/ مەبەستی شێخ و سمکۆ لە گفتوگۆ نهێنییەکە/ چوونی بۆ ئەنقەرە/ ڕێگەی سەفەرەکەی بۆ ئەنقەرە/ ڕێگەی گەڕانەوە/ نامەی ڕەشید جەودەت/ چەند دێڕێکی تر سەبارەت بە سەفەرەکەی بۆ ئەنقەرە لە نامەیەکمدا/ ناوەرۆک.

تێبینیی یەکەم: نە لە مەیان و نە لە بەشەکەی تریاندا، (بەش- بەرگ) نەنووسراوە؟ دەبوایە لەسەر ئەمەیان (بەشی یەکەم- بەرگی یەکەم) بنووسرێت...
تێبینیی دووەم: لەسەر بەرگ (ناهیدە) و لە یەکەم لاپەڕەدا (پاکیزە) نووسراوە؟

٢. بەسەرهاتی ڕەفیق حیلمی

نووسین: ناهیدە ڕەفیق حیلمی

پێداچوونەوە: کەژاڵ ئەحمەد

لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

چاپ: یەکەم، چ: ڕوون، ش: سلێمانی، ژس: ١١٣١، س: ٢٠٠٧، ل:٤٦٠، ق:١٦×٢٢

ناوەرۆک:

بەشی سێیەم: بەندکردنی لە سلێمانی- شەشی ئەیلوول و نەفیکردنی بۆ ناسرییە/ بەشی چوارەم: سەرۆکی باڵای حیزبی هیوا/ بەشی پێنجەم: نووسین و بەرهەمەکانی ڕەفیق حیلمی/ بەشی پێنجەم: لە بەرهەمەکانی تری نموونەی نامەی تایبەتی ڕەفیق حیلمی/ وێنە و بەڵگەنامەکان.

تێبینی: دەبوایە لەسەر ئەمەیان (بەشی دووەم- بەرگی دووەم) بنووسرێت...

کتێبی بێ ساڵ

٣. ڕەفیق حیلمی و سەرەتای ڕەخنەی زانستی لە ئەدەبی کوردیدا

ڕەفیق حیلمی

دەزگای ڕوشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی

یادداشت

رفیق حلمی

کوردستانی عیراق و شۆڕشەکانی شێخ محمود

بەشی سێهەم

ئامادەکردن و لێکۆڵینەوەو بیاچوونەوەی

پاکزە رفیق حلمی

نووسین: ئومێد ئاشنا

چاپ: ؟، چ: ؟، ش: ؟، ژس: ؟، س: ؟، ل:٣١، ق:١١×١٦

ناوەرۆک:

هیچ ناونیشانێکی تێدا نییە و بەم شێوەیە دەست پێدەکات: دەتوانین بە بەڵگەوە بیسەلمێنین، کە ڕەخنەی هاوچەرخ و زانستی لە ئەدەبی کوردیدا، لە ڕەفیق حیلمییەوە دەستی پێکرد. بڵاوبوونەوەی شیعر و ئەدەبیاتی کوردی بەرگی یەکەم ساڵی ١٩٤١، بزووتنەوە و گۆڕینی تەواوی خستە ناو جیهانە کپ و کۆنەکەی ڕەخنەوە.../ سەرچاوەکان.

چوارەم بیبلیۆگرافیا:

پێرستی (ڕەفیق حیلمی) لە ناوەرۆکی کتێبی کوردیدا ١٩٣٩- ٢٠١٠

١. گوڵدەستەی شوعەرای هاوعەسرم

نووسین: عەلی کەمال باپیر ئاغا

چاپ: یەکەم، چ: ژیان، ش: سلێمانی، ژس:؟، س: ١٩٣٩، ل:٥٥، ق:١٥×٢٣

ناوەرۆک:

ڕەفیق حیلمی.

٢. چیم دی- بەرگی دووەم- وێنە و شۆڕشەکانی شێخ مەحموودی مەزن

نووسین: ئەحمەد خواجە

بە فەرمانی وەزارەتی سەقافە و ئیعلام و یارمەتیی وەزارەتی شئوونی شیمال چاپکراوە

چاپ: یەکەم، چ: کامەران، ش: سلێمانی، ژس: ؟، س: ١٩٦٩، ل:١٦٦، ق:٢٤×١٧

ناوەرۆک:

چوونم بۆ بازیان و ڕۆژنامەکە و کاک ڕەفیق حیلمی.

٣. لە یادی شەهیدان و ئەدیبانی کوردستان- بەرگی یەکەم

نووسین: حەبیب عەلی میرانی

چاپ: یەکەم، چ: ئاداب، ش: نەجەف، ژس: ١١٦، س: ١٩٧٣، ل:٧٧، ق:١٢×١٦

ناوەرۆک:

باس و کورتە ژیاننامەی کۆمەڵێک لە ناودارانی کورد کە هەندێکیان بە (هۆنراوە) و لەسەر هەندێکیشیان بە نووسین... وەک: ڕەفیق حیلمی.

٤. چەند وتارێک دەربارەی ئەدەب و ڕەخنەی کوردی

نووسین: کەمال مەمەند

چاپ: یەکەم، چ: ئەلحەوادیس، ش: بەغدا، ژس: ٣٧٦، س: ١٩٨١، ل:١٤٢، ق:١١×١٦

ناوەرۆک:

ڕەفیق حیلمی و ڕەخنەی ئەدەبیی کوردی.

٥. مێژوو- کورتە باسێکی مێژوو و کورد و مێژوو

نووسین: د.کەمال مەزهەر ئەحمەد

بە یاریدەی ئەمینداریێتی گشتیی ڕۆشنبیری و لاوان چاپکراوە

چاپ: یەکەم، چ: دار ئافاق ئەلعەرببیە، ش: بەغداد، ژس: ٨٤٣، س: ١٩٨٣، ل:٣٨٤، ق:١٦×٢٣

ناوەرۆک:

ڕەفیق حیلمی و ئەحمەد تەقی و ئەحمەد خواجەو یادداشتنووسی...

٦. ناڵەی دەروون- کۆمەڵە ووتارێکی وێژەیی و مێژوویی و ئاینیی و کۆمەڵایەتین- بەشی دووەم

نووسین: شێخ محەممەدی خاڵ

بە یارمەتیی لیژنەی نیشتمانیی ئاهەنگگێڕان بە بۆنەی هاتنی

سەدەی پانزەیەمی کۆچییەوە لە کۆماری عێراق چاپکراوە

چاپ: یەکەم، چ: ئیرشاد، ش: بەغدا، ژس: ١٣٩٠، س: ١٩٨٥، ل:٢٢٣، ق:١٧×٢٤

ناوەرۆک:

چلەی ڕەفیق حیلمی.

٧. ئەم قسانە بەم پێوانە باویان نەماوە

نووسین: د.حەسەن جاف

چاپ: یەکەم، چ: زەمان، ش: بەغدا، ژس: ٢٢٣، س: ١٩٩٦، ل:٩٦، ق:١٢×١٦

ناوەرۆک:

وێنەی چەند ناودارێکی کورد لە کتێبەکەدا هەیە: ڕەفیق حیلمی.

.٨

گەشتێک بە نێو بیرەوەرییەکاندا

نووسین: کەریم حوسامی

لە بڵاوکراوەکانی بنکەی چاپەمەنیی ڕۆژ

چاپ: یەکەم، چ:؟، ش: سوید- ستۆکهۆڵم، ژس: ؟، س: ١٩٩٧، ل:٣٠٣، ق:١٦×٢٢

ناوەڕۆک:

پێشەکی/ یادداشتەکانی مامۆستا ڕەفیق حیلمی ١٩٥٦.

تێبینی: ژمارەی سپاردنی نییە و کۆدی ISBN: ٩١-٨٩١٥٠-٠١-٥ وەرگرتووە.

.٩ ژیاننامەی مێژوونووسانی کورد- بەرگی یەکەم

نووسین: عوسمان سەید قادر

لەسەر ئەرکی ڕێکخراوی (HelpageInternational) چاپکراوە

چاپ: یەکەم، چ: بەدرخان، ش: سلێمانی، ژس: ٨٨، س: ٢٠٠١، ل:٢٧٦، ق:١٦×٢٢

ناوەڕۆک:

مامۆستا ڕەفیق حیلمی.

.١٠ سێ ڕۆژنامەی ڕۆژگاری شێخی نەمر ١٩٢٣- ١٩٢٤

ئامادەکردن: ڕەفیق ساڵح

لێکۆڵینەوە: د.کەمال فوئاد و سدیق ساڵح

لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە

چاپ: یەکەم، چ: بەدرخان، ش: سلێمانی، ژس: ١٣٢، س: ٢٠٠١، ل:٢٢٠، ق:٢١×٣٣

ناوەڕۆک:

ژیاننامە: ڕەفیق حیلمی.

.١١ ناودارانی کورد

نووسین: میر بەسری

وەرگێڕانی لە زمانی عەرەبییەوە: عەبدولخالق عەلائەددین

لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپ: دووەم، چ: سەردەم، ش: سلێمانی، ژس: ٥٩، س: ٢٠٠٢، ل:٢٥٢، ق:١٦×٢٤

ناوەڕۆک:

ڕەفیق حیلمی.

١٢.  ڕەخنە و ئایدیۆلۆژیا

نووسین: حەیدەری حاجی خدر

لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی فیکریی و ئەدەبیی نما

چاپ: یەکەم، چ: دیلان، ش: هەولێر، ژس: ؟، س: ٢٠٠٥، ل:١٢٢، ق:١٤×٢٠

ناوەڕۆک:

ڕەفیق حیلمی و هێڵە سەرەتاییەکانی ڕەخنەی ئایدیۆلۆژیی.

١٣. مێژووی ئەدەبی کوردی ١٩٤٥-١٩٧٥ بەشی شەشەم

نووسین: د.مارف خەزنەدار

لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

چاپ: یەکەم، چ: و-پەروەردە، ش: هەولێر، ژس: ٧١، س: ٢٠٠٦، ل:٦٣٣، ق:١٧×٢٣

ناوەڕۆک:

بەشی بیست و پێنجەم: ڕەفیق حیلمی.

١٤. کوردایەتی بیر و بزاڤە- وەڵام و پەرچدانەوە

نووسین: کامیل ژیر

لەسەر ئەرکی (حەوتەی مژدەبەر؟) چاپکراوە

چاپ: یەکەم، چ: بابان، ش: سلێمانی، ژس: ١٨، س: ٢٠٠٦، ل:٢٦٠، ق:١٥×٢٢

ناوەڕۆک:

ڕەفیق حیلمی لە ئیبراهیم ئەحمەد زوێر بوو.

١٥.  دۆزا کوردستان

نووسین: قەدری جەمیل پاشا (زنار سلۆپی)

لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری و دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بیر

چاپ: یەکەم، چ: باریش، ش: دیاربەکر، ژس: ؟، س: ٢٠٠٧، ل:٢٨٤، ق:١٣×٢٠

ناوەڕۆک:

تێکلیێن ب ڕەفیق حیلمی بەگ ڕە.

تێبینی: ژمارەی سپاردنی نییە و کۆدی ISBN: ٩٧٨-٩٧٥-٠١٥٠٥-٤-٨ وەرگرتووە.

١٦.   کەرکوک و بزاڤی شیعری کوردی- لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندن

نووسین: د.محەممەد ئەحمەد سەعید (کەساس جەباری)

لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپ: یەکەم، چ: سەردەم، ش: سلێمانی، ژس: ٨٧٤، س: ٢٠٠٧، ل:٣٦٩، ق:١٦×٢٢

ناوەرۆک:

بەشی سێیەم: دەستەی شاعیرانی دیالێکتی کرمانجی خواروو/ ڕەفیق حیلمی و شێخ ڕەئووفی خاناقا.

١٧.   گۆران لە یادەوەری هاوچەرخەکانیدا

ئامادەکردن و کۆکردنەوە: مامۆستا جەعفەر و ڕێبوار حەمەتۆفیق

چاپ: یەکەم، چ: حەمدی، ش: سلێمانی، ژس: ٥٠٨، س: ٢٠٠٧، ل:٥٧٦، ق:١٦×٢٤

ناوەرۆک:

ڕەفیق حیلمی.

١٨.   ناڵەی دەروون- کۆمەڵە وتارێکی وێژەیی و مێژوویی و ئاینی و کۆمەڵایەتین

نووسین: شێخ محەممەدی خاڵ

لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

چاپ: یەکەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژس: ٥٢٥، س: ٢٠٠٧، ل:٣٦٠، ق:١٦×٢٣

ناوەرۆک:

چلەی ڕەفیق حیلمی.

١٩.   یادداشت نامەی ژیانم

نووسین: جەمال بابان

لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرایەتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

چاپ: یەکەم، چ: ڕوون، ش: سلێمانی، ژس: ١١٣٠، س: ٢٠٠٧، ل:٣٩٦، ق:١٦×٢٢

ناوەرۆک:

مامۆستا ڕەفیق حیلمی و عەبدولفەتاح ئیبراهیم و من.

٢٠. بەڵگەی زیندوو- کۆمەڵێ بابەتی زیندوو سەبارەت بە ئەدەب و مێژوو

نووسین: عومەر مەعرووف بەرزنجی

چاپ: یەکەم، چ: شڤان، ش: سلێمانی، ژس: ٢١٠٠، س: ٢٠٠٨، ل:١٧٠، ق:١٥×٢٠

ناوەرۆک:

ئەنجومەنی نوێنەران و بانگەوازی ڕەفیق حیلمی.

٢١. ڕۆژنامەوانیی کوردی- گۆڤاری هیوا ١٩٥٧- ١٩٦٣ بەرگی پێنجەم

لێکۆڵینەوە و ئامادەکردن: د.هیمداد حسێن

لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

چاپ: یەکەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژس: ٧٥٧، س: ٢٠١٠، ل:٦٠٨، ق:١٧×٢٣

ناوەرۆک:

ژ٣٠ی س٤ ١٩٦٠: مامۆستا ڕەفیق حیلمی کۆچی دوایی کرد.

٢٢. کە بازنە و لاکێشەکان هەڵدەوەشێنەوە- ئاخاوتەی سیاسی و فەرهەنگیی کورد، دوێنێ و ئەمڕۆ

نووسین: فەرهاد شاکەلی

